# ڕۆڤار

بڵاوکراوەیەکی ڕۆشنبیرییە
و هەر ژمارەی تایبەتە بە داهێنەرێك
ژمارەی ٦١



## قەڵەمکێشی خەیاڵ

# بەدیع باباجان

**بەشداربووان**

د. مارف خەزنەدار
مەلا جەمیل رۆژبەیانی
محەمەدی مەلاکەریم
ئەحلام مەنسوور
د. محسن ئەحمەد عومەر
بەختیار سەعید

**ژمارەکانی داهاتوو:**

جەمال شارباژێری
شوکر مستەفا (نووسەر ، وەرگێڕ)

سەرپەرشتیاری گشتی: دڵشاد عەبدوڵڵا
ستافی ڕۆڤار: یاسین عومەر / سەباح ڕەنجدەر
هەڵەچن: نەورۆز حاجی سەید گوڵ
دەرهێنەری هونەری: حەمید ئازموودە
هێلکاری: بەدیع باباجان
ڕۆڤار : بڵاوکراوەیەکی ڕۆشنبیرییە/ هەر ژمارە تایبەتە بە داهێنەرێک
دەزگای ئاراس و سەردەم وەکوو پرۆژەی هاوبەش دوومانگ جارێک دەری ئەکەن
ناونیشان: هەولێر -شەقامی گوڵان-دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس
سلێمانی -شەقامی سالم -دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

ژمارەی تەلەفۆن سەرپەرشتیاری گشتی :
کۆرەک: ٠٧٥٠٤٥١٢٧٨٦ ئاسیا: ٠٧٧٠١٥٣٢١٤٥
Email:d.abdullah@araspress.com

# بەدیع باباجان هونەروەری باڵا

مارف خەزنەدار

هەندێ لە وێنە هێڵکارییەکانی کۆواری "گەلاوێژ" (١٩٣٩- ١٩٤٩) و وێنەی بەرگە کۆواری "نزار" (١٩٤٨-١٩٤٩) لەچلەکانی ئەم سەدەی بیستەمە سەرنجیان ڕاکێشام، ئەمە بووە هۆی ئەوەی لەبیرمدا هەواڵێک دروست ببێ، هونەروەرێکی کورد هەیە لە بەغدا دادەنیشێ و ناوی بەدیع باباجانە. لەو سەردەمەی مێردمنداڵیمدا بەئاواتەوە بووم بەدیع باباجان بناسم، بەڵام دیار بوو ئەم ئامانجە تەنیا لەو کاتەدا بۆ من دەهاتە دی کەدانیشتووی بەغدا بم، لەوێ ئامانجی تەواو کردنی خوێندنی زانستگام دێتە دی و بەدیع باباجان و گەلێ خەڵکی تری بە دیمەنی گێتی ئەدەبو هونەر و زانست دەبینم و دۆستایەتییان لەگەڵدا دەکەم.

خۆم لەبەغدا بینی، قوتابی کۆلێجی ئەدەبیات بووم، بیرم لە ناسینی بەدیع باباجان دەکردەوە، لەدڵی خۆمدا دەموت ئەگەر ببین بە برادەر ئاخۆ بەدیع وێنە بۆ بەرهەمەکانم دەکێشێ!؟ بەرهەمی من شایانی ئەوە دەبێ بەدیع باباجان وێنەی بۆ دروست بکا؟ وا هاتە بیرم ئەگەر وێنەم بۆ بکێشێ مانای ئەوەیە بەرهەمەکەی منی بە دڵ دەبێ.

خۆ ئەمە کارێکی گەلێک بەجێیە ئەگەر من هەوڵ بدەم نووسینم بگەیەنمە پلەیەک بەدیع باباجان وێنەی بۆ بکێشێ مانای ئەوەیە من کابرایەکی خودا پێداوم.

هەواڵی بەدیع باباجانم لە عەلائەدین سەجادی بیستبوو، چونکە ناسیاویم لەگەڵ ئەم مامۆستایە پێیش ئەویان بوو. بێ گومان بینینی بەدیع کارێکی ئاسان بوو، لەو سەردەمەدا پێش نیوەڕۆ مووچەخۆر بوو لە کارگێڕی گشتیی تۆپۆگراف (مدیریە المساحە العامە). بە ئێوارانیش لە نووسینگەیەک کاری دەکرد بەناوی "دارالخط العربی" لە ژوورێک لە نهۆمی دووەمی دوکانەکانی (بابلئەغا) لە شەقامی ڕەشید نزیک مزگەوتی مەرجانی بەناوبانگ لە بەغدا.

## یەکتری ناسین

دەمێک بوو مەشقی نووسینم دەکرد بە کوردی و عەرەبی، هەندێکیانم لە ڕۆژنامە و گۆوارەکاندا بڵاودەکردەوە. لەو ڕۆژانەدا کەوتبوومە سەر هەوەسی ئەوەی لە کتێبێکدا بڵاویان بکەمەوە. ئەمە هەلێکی لەبار بوو بۆ ناسینی و ئاشنایی پەیدا کردن لەگەڵ بەدیع باباجان، چونکە خۆم بە بەختیار دەهاتە پێش چاو ئەگەر برادەرایەتی لەگەڵ (بەدیع) دا بکەم، دیارە بەختیارتریش دەبم ئەگەر وێنە بۆ بەرهەمێکی ئەدەبی بکێشێ من دانەری بم.

پاش نیوەڕۆیەکی پاییزی بەغدا بوو. ئەوەی پاییزو زستانی بەغدای نەدیبێ بەوەسف دیمەنی دڵگیری پڕ لە هەست کردن بەجوانی سروشت لەناو مێشک و دەروونیدا وێنەی ناکێشرێ، لەپێشانا من وام دەزانی بەغدام تەنیا لەبەر ئەوە خۆش دەوێ چونکە کۆلێجی لێیە، ئەگەر لەوێ نەژیم نابم بە خاوەن بڕوانامەی تری زانستگا، بەڵام کە چوومە ناوییەوە خۆشەویستسم لایەنێکی تری ئەم شارەی گرتەوە، لەپێش هەموویاندا ئەو زاناو خوێندەوارو ڕۆشنبیرە کوردانەی لەوێ دەژیان، ئینجا شەقامی ڕشید و ڕووباری دیجلە و چایخانە بەناوبانگەکان و نامەخانە دەوڵەمەندەکان و چاپخانە گەورەکان و برادەری تازە و تەلەفزیۆنی تازە پەیدا بوو نەک تەنیا لە بەغدا، بەڵکو لە هەموو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، تەنانەت "ماستی هەولێر" بەرامبەر وەزارەتی بەرگری و کەبابی سلێمانی لە حەیدەرخانە ئەمانە دیاردەی لایەنی جوانی ئەم شارە بوون، گەلێ شتی تریش. بۆ من بەدیع باباجانیش یەکێک بوو لەم دیاردانە.

ئەو پاش نیوەڕۆیە لە قوتابخانەی ئامادەیی نێوەندی "الاعدادیە المرکزیە" دەرچووم، پاش نیوەڕۆیان لەوێ مووچەخۆر بووم، پێش نیوەڕۆیانیش قوتابی کۆلیجی ئەدەبیات بووم. بە گۆڕەپانی کارگێڕی پۆلیسی گشتی و موتەسەڕیفییەتی بەغداو وەزارەتی ناوەوە تێپەڕیم بەرەو ئەمینداری پایتەخت و ئینجا مەڵبەندی دادگا. لەوێ لە سەرەتای سووق ئەل سسەرای سووڕامەوە شەقامی موتەنەبی، ئەمە جێگەیەکی تایبەتی لەناو دڵمدا هەبوو، چونکە زۆربەی نامەخانەو چاپخانەکانی بەغدا لەسەر ئەو شەقامە و گەڕەکی پشت شەقامەکە بوون کە ناوی جەدید حەسەن پاشابوو، لە کۆتایی شەقامی موتەنەبی کەوتمە شەقامی ڕەشید، لەلای ڕاست سووقلئەمانە بوو، ئەمە بازاڕی میوەو هەموو سەوزەیەکی نۆبەرەی تازە پێگەیشتوو بوو، بەڕاستی ئەدگاری پێناس و ناوونیشانی شاری بەغدا بوو، بەڵام نازانم ئەمانە بۆچ شوێنەواریان ون بوو، بەتایبەتی لە دوای ڕووداوەکانی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨. ئینجا لە گۆڕەپانەکە پەڕیمەوە ئەوەی لە دواییدا پەیکەری شاعیری ناوداری عێراقی (مەعرووف ئەلڕەسافی) یان لێ دانا. لای ڕاستمی گرتبوو، سەرەتای بابلئەغا بوو، زۆربەی دوکانەکانی جام و چوارچێوە و وێنەی گەورە پیاوان و هونەروەرانیان لێ دەفرۆشت، بە تایبەتی وێنەی کچە ئەکتەرە جوانەکانی سینەمای هۆلیۆد و قاهیرەی میسر. پێش ئەوەی بگەمە مزگەوتی مەرجانی بەناوبانگ کە تەنیشتەکەی تەختە تەکیەی لەنگە فرۆشتن بوو، بەرامبەر سووقلسەففافیر بە قالدرمەیەکی تەسک و ڕک دەبوو سەربکەوم بۆ نهۆمی دووەم. یەکەمین ژووری سەر قالدرمەکە نووسینگەی ڕەحمانی کوڕی محەمەد ئەمین یومنی خۆشنووسی بەناوبانگی کوردی لێ بوو، ئەمە مۆرهەڵکەن بوو و تەمغەی لە کاوچووک دروست دەکرد. لەدوای چەند ژوورێک ئەو ژوورە بچووکە بوو کە لە سەر دەرگاکەی بە خەتێکی خۆش نووسرابوو "دارالخط العربی". بەدیع باباجان پاش نیوەڕۆیان کاری تێدا دەکرد. هونەروەری کورد لەگەڵ خۆشنووسێکی عەرەب ناوی مەهدی بوو لە ژوورەکە پێکەوە بوون. ئەوەی جێی گوشادی بوو بۆمن ئەوە بوو بەدیع خۆی قەرزاربار کرد بەرامبەر بە من، وا دیاربوو ناوی منی بیستبوو، تەنانەت نووسینەکانی منیشی پێ خۆش بوو، پێش ئەوەی من بە شانو باهۆی هونەری ئەودا هەڵبڵێم خۆی ئارەزووی دەروونی دەربڕی کە بەختیار دەبێ ئەگەر من داوای کارێکی هونەری لێ بکەم بۆ بڵاوکراویەکی ئەدەبی. ئیتر ئەمە ڕێی بۆ ئەوە خۆشکرد پێی بڵێم: بەڕاستی ئەوپەڕی بەختیارییە بۆ من هونەروەرێکی کورد وەک بەدیع باباجان بناسم، بێگومان ئەم ناسینەش ڕێگە بۆ ئەوە خۆش دەکا ئارەزووی هەردووکمان بێتە دی ئەگەر پێویست بوو بەدیع وێنەی هونەری بۆ من بکێشێ، هەر لەو بینین و ناسیاوییەش ئەو ڕاستییەم بۆ دەرکەوت کە بەدیع بڕیاری داوە هەرچی کارێکی هونەری پەیوەندی بە کوردەوە هەبێ تا ژیانی ماوە بە خۆڕایی و بەبێ پارە دەیکا، لەبەرئەوە کارە هونەرییەکانی لە نووسینگە دوو جۆر بوون، یەکێکیان داهێنانی هونەری ئەمەیان بێ پارە بوو، ئەویتر کاری تەمغەو مارکەی بازرگانی بۆ دەستگا و کۆمپانیا و خەڵکی تر، ئەمەشیان بۆ پارە بوو لە پێناوی سووک کردنی باری دارایی خێزانی، ئەمەشیان باوەڕ ناکەم ڕۆژێ لە ڕۆژان بەدیع مامەڵەی پارەی لەگەڵ ئەوکەسانە کردبێ کە مارکە و دروشمی بازرگانی بۆ دروست دەکردن.

## وێنەی هێڵکارییەکانی مێژووی ئەدەبی کوردی

ئەگەرچی لە دەوروبەری جەنگی دووەمی گێتی و پاش جەنگ بەدیع وەکو هونەروەرێکی شێوەکاری کورد ناوبانگی پەیدا کردبوو، بەوەی هەندێ لە بەرهەمەکانی لە ڕۆژنامە و گۆواری "گەلاوێژ" و "نزار"، بەڵام ناوبانگی تەواوی لە سەرەتای پەنجاکان پەیدا کرد، لەو کاتەی وێنەی هێڵکاری کۆمەڵێک لە شاعیرانی کلاسیکی کوردی کێشا بۆ کتێبی "مێژووی ئەدەبی کوردی" لەسەر داوای عەلائەدین سەجادی.

وەک لە بەهەشتییان عەلائەدین سەجادی و بەدیع باباجانم بیستووە ماوەیەکی زۆر پێکەوە خەریکی لێکۆڵینەوە بوون لە هەموو ڕوویەکەوە بۆ ئەوەی وێنەکان نزیکی ڕاستی ئەو سەردەمە بن کە شاعیرەکان تێیدا ژیاون لەڕووی نەژاد (ئەتنۆلۆجی) و ئەتنۆگرافییەوە، واتە پۆشینی جلوبەرگ و کەلوپەلی ئەو سەردەمانەوە. بەدیع ئەوەی دەردەبڕی خۆی پێبەستی بیروڕاو بۆچوونەکانی عەلائەدین سەجادی بوو، ئەگەر هەڵەیەکی بچووک ڕوویدابێ زیاتر ڕەچاوکردنی بیرو بۆچوونی سەجادی بووە، لەگەڵ ئەوەشدا گومانی تێدا نییە ئەو کۆمەڵە وێنەی

هێڵکارییە شۆڕشێک بوو لە مێژووی هونەری و خوێندەواری و ڕۆشنبیری کوردیدا.
بێ گومان کێشانی وێنەی شاعیرانی بەرزی وەک بابا تاهیر و مەلای جزیری و بێسارانی و خانی و نالی و سالم و مەولەوی و مەلای جەباری و سەی یاقۆ و کوردی و حاجی و مەحوی و سالمی سنە و مەجدی و حەریق و ئەدەب، کاریکی سایکۆلۆجی و کۆمەلایەتی گرنگ بوو لەدروستکردنی سیماو ئەدگاری هەلکەوتووانی کورد لە مێشک و دڵو ویژدانی تاکی کورد بە تایبەتیش هونەروەرێکی بەرزی وەکو بەدیع باباجان دروستی کردبن.







بڵاوکرایەوە.
ماوەیەکی کەم پێش کۆچی دوایی بەدیع باباجان لە مەڵبەندی ڕووناکی لە هەولێر لە ماڵی ئێمە میوانی نامەخانەکەمان بوو، کە بۆیەکەمین جار چاوی بە وێنەی نالی کەوت بە دیوارەوە هەڵواسرابوو، لێی نزیک بووەوە، بەوردی تەماشای کرد. من ئینفیعالی دەم و چاوی بەدیعم دەخوێندەوە، لەپڕ وتی: کتێبەکەی سەجادیم بۆ ناهێنی! منیش کتێبەکەم خستە بەردەستی، ئەو لاپەڕەیەم بۆ کردەوە کە وێنەی (نالی)یەکەی خۆی تێیدا کێشرابوو، وێنەکەی خۆی بەرامبەر بە وێنەکەی قەرەنی ڕاگرت و ڕووی کردە من و وتی: تەماشاکە ئەم هونەرەوە ژیرو بلیمەتە ئەم وێنەیەی ئەوەی لەسەر من دروست کردووە، بەڵام بزانە چی بوعدێکی هونەری داوەتێ، بڕوانە هونەروەر چی قووڵاییەکی خستۆتە چاوی نالی و چۆن دەنوارێتە مەجهوول، بە ڕاستی ئەم هونەروەرە لاوە جێگەی شانازییە.
لە دوای دروست کردنی وێنەی شاعیرانی کلاسیکی کورد لەلایەن بەدیع باباجانەوە هەندێ کەرەستەی تازە لەم لایەنەوە پەیدابوو لەمانە وێنەیەکی فۆتۆگرافی عەبدوڵڵا بەگی میسباح- دیوان (ئەدەب) لە بەرگی دوایی "دیوانی میسباح"ی چاپی مەهاباد بڵاوکراوەتەوە، وەک چاوەڕوان دەکرا لە وێنەکەدا میسباح لە سەرکورسی دانیشتووە و فێسی لە سەرەو ڕۆبی لەبەرە لەتەک مێزێک نووسینی کاغەز و کتێب و قەڵەم و مەرەکەبی لەسەرە، کورسییەکی تری ئەسکەمل ئاسایی لەو لاوە دانراوە، ژوورەکە لە ماڵی کەسێکی خوێندەوار و ڕۆشنبیری ئەوروپایی دەکا لە دووا ساڵانی سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتای سەدەی بیستەم. من باوەڕ ناکەم عەلائەدین سەجادی یا بەدیع باباجان چاویان بەم وێنەیە کەوتبێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا وەک دەم و چاو هەر دوو وێنەکە هەندێ

## هەندێ تێبینی لەم لایەنەوە

وێنەی شاعیرانی کورد ئەوانەی دەست وپەنجە ڕەنگینەکەی بەدیع دروستی کردوون، کۆمەڵێک لاوی هونەروەر لاسایی ئەویان کردەوە و دووبارە و سێبارە لەسەر وێنەکانی بەدیع وێنەی هێڵکاری و ئاویو ڕۆنی (زەیتی) ڕەنگاوڕەنگیان دروست کرد، هەندێکیان سەرکەوتوو بوون، بڕێکیشیان لە مەیدانی ئەم مەشقەدا سەرکەوتوو نەبوون.
لەسەرکەوتووەکان هونەروەرێکی هەڵکەوتووی کوردی وەک قەرەنی جەمیل کۆمەڵێک وێنەی ئاوی ڕەنگاوڕەنگی شاعیرانی کوردی دروست کرد. سەرچاوە بنچینەییەکەی وێنەکانی بەدیع باباجان بوون.
لەم وێنانەی قەرەنی جەمیل تەنیا وێنەی "نالی" بڵاوکراوەتەوە، ئەوانی تر لە ئەرشیف ماونەتەوە، ئەوەی نالی پێشکێش بە ئێمە کرا، وا بوو لە (دیوانی نالی و فەرهەنگی نالی)دا (١٩٧٧) بە ڕەش و سپی

لەیەکتری دەکەن، ڕەنگە ئەمە لە وەسفی ئەنۆتۆمی (اعضاء الجسم) هاتبێ، چونکە میسباح لە مێژەنییە کۆچی دوایی کردووە (١٩١٦)، هەرچی سەرپێچ و جلوبەرگیشە ڕاستتر ئەوەی وێنە فۆتۆگرافییەکەیە، چونکە قیافەتی میسباح وەک خوێندەوارارو ڕۆشنبیرێکی قاجاری و عوسمانی بوو، نەک کەسێکی کوردی دەشتەکی یا مەلاوفەقیەی حوجرە.

نموونەیەکی تری تەئسیری بەدیع بەسەر هونەروەری دیکەی کورد ئەوەیە وێنەی سەی یاقۆ (١٨٠٨-١٨٨١) بووە بەسەرچاوە بۆ هونەروەرێکی دیکەی کوردی ئێران بۆ کێشانی وێنەیەکی تازەی سەی یاقۆ لەسەر بەرگی "دیوانی سید یعقوب ماهیدشتی" لە ساڵی ١٣٦٣ هیجری قەمەری لە ئێران بڵاوکراوەتەوە. وێنەکەی بەدیع لاوەکییە واتە لای شانی شاعیر کێشراوە، کەچی هونەروەری کوردی ئێران کردوویەتی بە وێنەی بەرامبەری و داهێنانێکی هونەری تێدا کردووە بەوەی بە فریشتەیەک و قەڵەم و ساز و سەنتوورێک و پەڕە مووچە و شیرێک وێنەکەی ڕازاندۆتەوە.

## ئەغانی کوردستان

سێ چوارجار لەگەڵ بەدیع باباجان دانیشتین بە وردی لە ناوەرۆکی کتێبی (ئەغانی کوردستان) گفتوگۆمان کرد. سەرسوڕمانی من بێ سنوور بوو لە تێگەیشتنی بەدیع لە شیعرە کوردییەکان، بە زمانی کوردی پێش ئەوەی ئاگاداری وەرگێرانی شیعرەکان بێ بۆزمانی عەرەبی، بەدیع وا دەهاتە بەر چاوم وەک شاعیرێکی بەرزو قووڵ بێ، نەک تەنیا خاوەن چێژێکی ئەدەبی بێ.

ماوەیەکی زۆر لەگەڵ ئەم شیعرانەدا ژیا، وەک خۆی وتی: هەندێکیان کاریان تێکرد و وێردی زمانی شەو ڕۆژم بوون، لە خەیاڵمدا ئاوا نەدەبوون.

لە هەموو داواکارییەکم پەلەم لە بەدیع نەدەکرد، ئاگاداری ئەوەبوو ئەو وێنانەی بۆ من دروستیان دەکا دەبێ داهێنانیان تێدا بێ، وەک ئەو دروشمە بازرگانیانە نەبوون کە بۆ کۆمپانیاو دەستگا ئابوورییەکانی دروست دەکرد. جارێکیان وتی: هەندێ شیعر هەیە زۆر حەز دەکەم وێنەی تەعبیرییان بۆ دروست بکەم، بەڵام ئیلهامم بۆ نایە، هەندێ جاریش سەر پێی شیعرێکی تر دەخوێنمەوە کەچی ئیلهامم بۆ دێ‌و دەروونم فرمان دەرددەکا کە بیخەمە سەر کاغەز، کە کارەکە دەگاتە ئەنجام پەشیمان نابمەوەو بەهی خۆمی دەزانم.

ماوەیەکی زۆر نووسینەکانم لای بەدیع باباجان مانەوە، ئێوارەیەکیان ڕەنگە هەنگامێک بوو بێ لە بەختەوەرترین سەردەمی سەرانسەری ڕۆژگاری ژیانم کە کۆمەڵێک وێنەی هێڵکاری پێشکێش کردم بۆ کتێبی "ئەغانی کوردستان" وێنەکان بریتی بوون لە:

١-وێنەی بەرگی کتێبەکە.

٢-وێنەی چوار چێوەیەکی هونەری لە پەڕەکاغەزێک و شووشەیەکی مەرەکەب و پەڕەمووچێک پێک هاتبوو، لە سەر کاغەزەکە وشەکانی












پێشەکی کتێبەکەم نووسیوە.

٣-وێنەی کچێکی کورد بە کرمەکی مێخەک و سملەوە بۆ شیعری "خەندەکەی بایی" دلدار.

٤-وێنەیەکی هێڵکاری تەعبیری ڕۆمانتیکی وسیمبۆلی ئامێز بۆ شیعری((یادگارو هیوا))ی ئیبراهیم ئەحمەد.

لەوساوە لەگەڵ بەدیع باباجان دا زۆر لەیەکترییەوە نزیک بووین، بەقسەی خۆی لەگەڵ ئەوەی هەموو کارێکی هونەری کە بێ پارە بۆی گەیاندوومەتە ئەنجام، کەچی هێشتا ئەو قەرزاری منە، نەک من قەرزاری ئەو بم، لەم لایەنەوە دەیوت: ئەو کارانەی کە تۆ بە منیان دەسپێری بۆتیان بکەم کارێکن پێویستیان بە وردبوونەوەو لێکۆڵینەوەو بیری قووڵ هەیە، ئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی زۆر بیر بکەمەوە، لەئەنجامدا بەرهەمێک دروست دەبێ لەپلەی کارەکە دەبێ، بەمە شەپۆلی چێژی هونەری بەرز لەدڵ و دەروونم دەکەوێتە حاڵەتی شۆڕش، ئیتر خۆم بە بەختەوەرترین کەسێک دەزانم.

## هونەر بەرادان

هەندێ جار ڕۆشنبیرانی کورد داوای وێنەی هێڵکارییان لە بەدیع دەکرد بۆ بەرهەمە ئەدەبییەکانیان، هی وایان تێدا بوو گوێی نەدەدایە پلەی هونەری بەرهەمەکەی هونەروەر، لەبەرئەوە گەلێ جار دادەماو ئەو بەرهەمەی دەیهێنایە کایەوە بەدڵی نەدەبوو، بەڵام بەدڵی ئەو کەسە دەبوو کەداوای لێ کردبوو، بۆیە لەم لایەنەوە بۆ ئەوەی لەکۆڵی ببێتەوە بەوە ڕازی دەبوو کە بڵاوی بکاتەوە، یەکێ لەو بەرهەمانە وێنەی بەرگی کتێبی((دوا ماڵئاوایی))(بەغدا ١٩٩٢)ی(شێرۆ موفتی)یە لەگەڵ پێنج وێنەی هێڵکاری لەناو کتێبەکەدا بڵاو کراونەتەوە. ئەوی سەرنج ڕادەکێشێ ئەوەیە وێنەی بەرگەکە / ئەگەرچی / تەعبیر لەساتێکی بیر کردنەوە لە خۆشیو ناخۆشی ژیان ناکا، بەڵام جێ پەنجەی بەدیعو شێوازی بەدیعیانەی پێوە دیارە، بە تایبەتی پەنجەکانی دەستو پێی کچەکە یا پەرییەکەی، کەچی ئەوانەی ناو کتێبەکە ئەگەر مۆری بەدیعیان پێوە نەبوایە کەس نەیدەزانی ئەم هونەروەرە هەڵکەوتووە دروستی کردوون، زیاتر لەونەقشو مۆزایکانە دەکەن کەلەکۆندا دامەنی ئەو لاپەڕە سپیانەیان پێ پڕ دەکردەوە کەبەشێک لەبەشەکانی کتێب تەواو دەبوو و هەندێ بەشی سپی لەلاپەڕەکەدا دەمایەوە.

## لەپێناوی ڕۆشنبیری کوردیدا

لەو ڕۆژگارەی دەستم کرد بە بڵاوکردنەوەی کۆمەڵێک کتێبی شیعرو چیرۆکو ئەدەب لەناوەڕاستی پەنجاکانی ئەم سەدەیە لەبەغدا داوام لەبەدیع باباجان کرد وێنەی چەند بەرگێکیانم بۆ بکێشێ، هەندێ وێنەی دروست کرد، بەتایبەتیش هەوڵیدا بەرگەکان ڕەنگاو ڕەنگ بن. چاپی ڕەنگاو ڕەنگ لەو سەردەمەدا تازە پەیدا ببوو ئەرکی گەلێ قورس بوو، دەبوو بەرگەکە سێ جار یا زیاتر چاپ بکرێ بۆ ئەوەی ڕەنگاو ڕەنگ دەربچێ.

بەدیع باباجان

# پێکەنینی گەدا

بەدیعی هونەروەر چەند وێنەیەکی دروست کرد، لەناو ئەمانەدا بەرگی دیوانی سەلام بەدڵی هەموو لایەک بوو، لەبەر ئەوە هەڵبژێردراو دیوانەکە لەبەغدا لەساڵی(١٩٥٨)دا چاپ کرا، ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێ بۆ دەستە هونەروەرییەکەی بەدیع باباجان ئەوەیە ناوی شێخ سەلامی شاعیری بەوشەی ((سەلام)) واتە((ئاشتی)یەوە بەستەوە، هەروەها ناوەڕۆکی دیوانەکە کەبابەتی ئاشتی لەناو شیعرەکانی( شیخ سەلام)دا زاڵە بەسەر بابەتەکانی ترەوە. وێنەکە ڕەنگدانەوەی بیرێکی مرۆڤایەتی و خەیاڵێکی فراوانە. هونەروەر هاتووە پەرییەکی لەناو هەورەوە هێناوەتە خوارەوەو جلی کوردی لەبەر کردووەو چڵە زەیتوونێکی بەدەستەوە گرتووەو لەگوندێک لەگوندەکانی کوردستان دەیچێنێ. ئەم وێنەیە یەکێکە لەبەرهەمە هونەرییە سەرکەوتووەکانی بەدیع باباجان. کەچی لەپاش سی و سێ ساڵ ئومێد کاکە ڕەش لەساڵی(١٩٩١) کەچاپی دووەمی دیوانی سەلامی گەیاندۆتە ئەنجام، وێنە هێڵکارییەکەی بەدیع باباجانی پشت گوێ خستووە، ئەو وێنە تازەیەی بۆ ئەم چاپی دووەمە بەڕادان داوە، بەهیچ جۆرێ ڕووی نییە بەرامبەر بەوێنە هێڵکارییەکەی بەدیع باباجان بوەستێ. بۆ زیاتر زانیاری پەیداکردن لەم بابەتەوە دەتوانرێ تەماشای ئەم سەرچاوەیە بکرێ: (گەشتێک بەناو هەردوو چاپەکەی دیوانی سەلامدا، گۆواری ((مامۆستای کورد)) ژمارە(٢٧)، پاییزی ١٩٩٥، سوولەنترونا- سوید، ل٥٨-٦٤).

لەپرۆژەی بڵاو کردنەوەی کتێبی کوردی بەدیع باباجان یارمەتییەکی دڵسۆزانەی پێشکێش کردم، جگە لەکێشانی وێنەی هێڵکاری بۆ بەرگ و ناوەڕۆکی کتێبەکان هەندێ دروشم و شیعری نایابیشی دروست دەکرد، لەناو ئەمانەدا پێویستە پەنجە بۆ دوو دروشم درێژ بکرێ،

ئەمانەی بۆ((نامەخانەی گەلاوێژ))ی سلێمانی دروست کردبوو، ئەوکاتە خاوەنی نامەخانەکە ڕەئووف مەعرووف بوو، زۆربەی کتێبەکانی بەیارمەتی ئەو و لە بلاوکراوەی نامەخانەی ئەو بوون، شیعرەکان لەسەر بەرگی کتێبەکانو ناوە وەیان بلاو دەکرانەوە، بەتایبەتی وێنەی شیعرەکانی لەکتێبی((دیوانی حەمدی)) (١٩٥٧) و ((شێخ مەحموودی زیندووی)) محەمەد سالح دیلان (١٩٥٨) و ((دیوانی سەلام)) (١٩٥٨) بەرچاو دەکەون.

یەکێ لە وێنە هێلکارییە ڕەنگینەکانی بەدیع باباجان ئەو مارکەیە بوو کە بۆ چای سەیلانی دروست کردبوو بەناوی((پیرەمەگروون))ەوە. لەو سەردەمەدا کۆمەڵێک بازرگانی و پارەداری بازاڕی سلێمانی پەیمانیان لەگەڵ کۆمپانیایەکی چای سەیلان بەستبوو، مارکەکەیان لەسلێمانیەوە ناردبووە هیندستان لەوێوە بەناوی((چای پیرەمەگروون)) چایەکی باشی سەیلانیان دەنارده سلێمانی.

گەڕان بەدوای شوێنەواری بەدیع باباجان کارێکی قورسە، یەکێکی وردو ژیری گەرەکە، جگە لەوەش پێویستە لەنزیکەوە ئاگاداری ژیانو جموجوڵی هونەری و خوێندەواری بەدیع بێ، هەروەها پسپۆڕی نامەخانەی کوردی و مێشکێکی ئەنسکلۆپیدی هەبێ، ئەگینا ناتوانێ ئاگاداری ئەوەبێ لەوکاتەی عەلائەدین سەجادی ویستوویەتی کتێبی((شۆڕشەکانی کوردو کوردو کۆماری عێراق)) دابنێ، ویستوویەتی کتێبەکەی وێنەداربێ، بۆ هەمووبەشەکانی وێنەی فۆتۆگرافی و هێلکاری دەستکردی چنگ کەوتووە، تەنیا لەباسی((شۆڕشی حەمە پاشا)) نەبێ، مەبەست لەحەمە پاشا، (پاشای کۆرە)ی ڕواندوزە. ئەم وێنەیەی بەدیع تەعبیر لەکەسێکی زیرەکو ئازای کوێر دەکا، تۆپەکانی جەنگی ئەم پاشایە لەناوچەکەدا بەناوبانگن... لەوێنەکەدا دەستی خستۆتە سەرتۆپەکەو وەک بڵێی پاشایەک چاوی هەیە، بەلام هەر بەو چاوەوە قەلا سوپاییەکەی پشت خۆی دەبینێ، وەک ئاشکراشە ناوچەی سۆران ناوبانگی بەقەلا سوپاییەکان دەرکردووە.

دروستکردنی تیپە تایبەتەکانی زمانی کوردی بۆ چاپخانە لەسەرەتای پەیدا بوونی چاپخانە لەناوچەی ئێمەدا تا دوای جەنگی دووەمی گێتی چاپ کردن بەڕێگەی تیپچینی بووە، بەزۆری ئەم تیپانە لەئەڵمانیا دادەڕێژران، لەپاشاندا فابریقەی تیپ دارشتن لەولاتی میسریش پەیدابوو. لەدوای جەنگ لاینۆتایپ کەوتە لای ئێمەشەوە.

واتە ئەم جۆرە چاپە بریتی بوو لەقاڵبی تیپەکان وەک تایپرایتەر قاڵبەکان بەتیپی دیری نووسینەکە کۆدەکرانەوە، ئینجا بە مس و ( رصاص ) دیرەکە لەئەنجامی لەقاڵب دان دروست دەکرا. لەسەرەتای پەنجاکانی ئەم سەدەیە یەکەمین چاپخانەی لاینۆ تایپ لەبەغدا دامەزرا. لەپێشانا تەنیا قاڵبی تیپەکانی(ئەلف بێ)ی عەرەبیان هەبوو، لەپاشانا قاڵبی تیپە فارسییەکانیشیان دروست کرد. ئێمە کە دیوانی((رازی تەنیایی)) ئەحمەد هەردیمان لەساڵی ١٩٥٧ لە چاپخانەی((شەفیق)) لەبەغدا لەچاپ دا، قاڵبی لاینۆ تایب هێشتا بۆ ئەو تیپە کوردیانە دروست نەکرابوو وەک تیپە بزوێنەکانو تیپی(ل)و(ر)ی کەئیشارەت لەسەرو ژێریانەوە بوو.

چەند ساڵێک پێش ئەو سەردەمەو هەر لەدوای پەیدابوونی لاینۆ تایپ، زانای مەزن مامۆستامان تۆفیق وەهبی لە سەرەتای پەنجاکان بیری لەوە کردەوە، من و بەکر دلێر دەورمان لەو کارەدا هەبوو. چونکە بایەخی تایبەتیمان بە ئیملاو ڕاست نووسینی کوردی دەدا، وابوو پێشنیازم بۆ تۆفیق وەهبی کرد، بەهۆی منەوە پێوەندی بە هەندێ لە خاوەن چاپخانەکانی بەغداد کرد. ئەوان لە مەسەلەکە شارەزاتر بوون لە رووی تەکنیکەوە. خاوەن چاپخانەکان داوایان لە کۆمپانیاکانی لاینۆ تایپ کرد لە ئەڵمانیا بیر لە (ئەلف و بێ) ی کوردی بە تیپی عەرەبی بکەنەوە. وابوو وێنەی هەموو تیپە عەرەبی و فارسیەکانیان نارده بەغداد. هەر تیپێک لە سەرەتایی وشە یا ناوەڕاست یا دوایی . پێوە نووسان و پێوە نەنووسان لەسەر کارتێکی تایبەتی وێنەی کێشرابوو، ئیتر پێویست بوو هەر کاتێک بۆ ئەوەی ببێ بە تیپی کوردی و لەگەڵ دەنگەکانی زمانی کوردی لەسەر دەنگەکانی زمانی کوردی ڕێک بکەوێ، دەبوو دەسکاری تێدا بکرێ . لە رووی گەیاندنی ئەم کارە بە ئەنجام پێشنیازی من ئەوە بوو مەسەلەکە بە بەدیع باباجان بسپێرێ . زانای ناودارو هونەروەری بە توانا یەکتریان ناسی چەند جارێک پێکەوە کۆبوونەوە، ئەو تیپانەی سەر کارتەکان ئەوانەی پێویست بوو دەستکارییان تێدا بکرێ بەدیع بە قەڵەمە تیژو ڕەنگین و جوانەکەی ئیشارەتی لەسەر (ل) و لەژێر(ر)ی هەموو تیپەکانی تر دانا ، ئیتر خاوەن چاپخانەکان کارتە دەست لێدراوەکانیان ناردەوە بۆ کۆمپانیاکانی دروستکردنی ئامێری چاپ و لە دوای ماوەیەک قاڵبی ئەم تیپانەش گەیشتە هەموو چاپخانەکانی بەغداو مەشقی ڕاست نووسینی زمانی کوردی لە چاپخانەکانی لاینۆ تایپیش کەوتە پراکتیکەوە.

ئەگەر من بە هەڵە نەچووبم ڕەنگە ((دیوانی سەلام)) ئەوەی لەم وتارەدا پەنجەم بۆ درێژکردووە یەکەمین کتێبی کوردی بێ بە لاینۆ تایپ چاپکرابێ بە ڕاست نووسینی هەرەتازەی زمانی کوردی ، لەمەدا ئەو ڕاستییەمان بۆ دەردەکەوێ بەدیع باباجان بەشداری دڵسۆزانەی لە دیوانی سەلام کردووە بە کێشانی وێنەی هێلکاری بەرگی دیوانەکە و لە پاشانا یەکەمین تاقی کردنەوەی ئەو تیپە کوردیانەی بەدیع باباجان ڕێکی خستبوون بۆ کۆمپانیای چاپخانە لە ئەڵمانیا لەسەر لاپەڕەکانی دیوانی سەلام بوو.

## من و بەدیع باباجان لە دوای هەشت ساڵ لێکدابران

لە بەهاری (١٩٦٨) کە لە روسیا گەڕامەوە ولات، بەدیع باباجان و محەمەد تۆفیق وردی یەکەمین کەس بوون پێشوازییەکی گەرمیان لێ کردم . گەلێ گۆشاد بووم بە قسەکەی بەدیع باباجان کەلە پاش گەڕانەوەم بۆ ولات پێی وتم: من بۆیە پەلەم بوو زوو چاوم پێت بکەوێ، چونکە لەوە دڵنیا بووم پێش هەموو کەس دەهاتی بۆ نووسینگەکەم لە بابلئەغای شەقامی ڕەشید. بەدیع بەمە دڵنیای کردم ئەو دەزانێ سۆزی

خۆشەویستیم لەبەرامبەری لەچی پلەیەک دایە .

هاوڕێیەتی ڕەسەن و کۆن نابێ، دوورکەوتنەوەی کاتی پێوەندی گیانی لە نێوان خۆشەویستاندا بەهێزتر دەکا. ئەم جارە وەکو مامۆستایەکی زانستگاو کارکەرێکی مەیدانی ڕۆژنامەگەری کاتم بە دەستەوە کەم بوو . ئەو ماوەیەم نەبوو ئامانجەکانی خەیاڵ و چێژو سۆزم وەکو پێویست بهێنمە دی، بەڵام لە بەدیع باباجان غافڵ نەبووم، بابلەئاغاو شەقامی ڕەشیدم لە ئەدگاری ئەودا دەدی، بۆیە زوو زوو سەرم لێ دەدا، سەردانەکانمان بۆ بینینی ئەو بوو، نەک کێشانی وێنەیەکی هێڵکاری، لەو بینینانەدا بێ ئەوەی بەرنامە دابنێین پرۆژەی هونەری لە خۆیەوە دروست دەبوو. ئێوارەیەکیان دروشمێکی بازرگانی بە دەستەوە بوو. ئێمە لە گفتوگۆدا بووین، من دەمزانی بەدیع ئەگەر کارێکی هونەری نەقڵ کردنی بەدەستەوە بێ، دەربەست نییە، هەر لەو کاتەی کار دەکا لە گفتوگۆ ناوەستێ، بەڵام بە پێچەوانەوە، لەکاتێک کاری هونەری داهێنانی تێدا بێ دەبو مێشک و هەست و نەستی لەگەڵ کارەکە بێ، لەبەر ئەوە بوو زۆربەی ئەو کارانەی لە ماوەڵەوە دەگەیاندە ئەنجام .

هەرچۆنێک بێ ئەو ئێوارەیە وتی: وێنەیەکی فۆتۆگرافی خۆت لەبەردەست نییە؟ ڕێکەوت وێنەیەکی بچووکی ڕەش و سپی خۆمم لابوو، لێی وەرگرتم و لەسەر ئەو وێنە فۆتۆگرافییە وێنەیەکی هێڵکاری بۆ دروست کردم . من ئێستاو ئەوساش بە شانازیەوە دەڕوانمە ئەو وێنە هێڵکارییەی بەدیع باباجان، چونکە ئەم هونەروەرە گەورەو ڕەسەنە بە دەگمەن وێنەی پۆرترێتی هێڵکاری بۆ زیندووان کێشاوە، بێگومان سەرکەوتنی لە وێنەکەی خۆی لەوەوە هاتووە خۆی لە هەموو کەسێک شارەزاترە لەخۆی ، لە وێنەکەدا دوور دەنوارێ قووڵ بیر دەکاتەوە .

جگە لەمە بەدیع هەندێ وێنەی هێڵکاری تری سەرکەوتووی بۆ کتێبەکانی من کێشاوە لەساڵانی حەفتاکاندا. لەسەرەتای ساڵی (١٩٧٠) لەو کاتەی خەریکی دامەزراندنی یەکێتی نووسەرانی کورد بووین ، لەبەر ئەوەی لە دەستەی دامەزرێنەر من لە هەموویان زیاتر لە بەدیع باباجانەوە نزیک بووم. بۆیە من ڕاسپێرابووم لەگەڵ بەدیع قسە بکەم بۆ مەسەلەی دروستکردنی دروشمی یەکێتی نووسەرانی کورد لەلایەن ئەو هونەروەرەوە. وابوو سەردەمێکی گیانی خۆشم بردە سەر لە ماوەی گفتوگۆ دوورو درێژەکانمان لەم لایەنەوە. بەڕاستی نازانم لەو ڕۆژگارەدا من زیاتر سوودم وەرگرت یاخود بەدیع باباجان، ئەوەی گرنگ بێ ئەوەبوو وەک بڵێی بیرمان بەدەرزی هەڵدەکەند، لە هەموو لایەکی مەسەلەکە ورد دەبوینەوە. کێشەی بنچینەییمان ئەوەبوو دروشمەکە زادەی بیری کلاسیکی ئەکادیمی بێ، یا ئەبستراکتی تازە بابەت بێ، لەبەر ئەوە ئێمە هەردووکمان بەتایبەتی بەدیع لایەنی کلاسیکی بوو. بۆیە ئەنجام دەبوو هەر ئەو دروشمە نایابە بێ کە ئێستاکە لە ناوەوەیە، ئێمە دەوری یەکەمی کۆواوی ((نووسەری کورد)) ی ئۆرگانی یەکێتی نووسەرانی کوردمان بەم دروشمە بڵاوکردەوە، هەموو ژمارەیەکی ئەو دەورەیە بەو دروشمە جوانە دەرازایەوە، ئەوەی جێی داخە بۆچ دەورەکانی دوایی کۆواوی "نووسەری کورد" ئەم دروشمەیان خستە پشت گوێ؟ نازانین بۆچ مۆدەی کورد هەر کەژێکە! بەگوڕ پەیدا دەبێ و زوو ون دەبێ. ئەم دروشمەی بەدیع باباجان بۆ یەکێتی نووسەرانی کورد ئەمری لە خۆیدا هەڵگرتووە و بۆ هەموو دەورو زەمانێک دەست دەدا، ئیتر بۆچ وازی لێ بهێنرێ! من لەوە دڵنیام ڕۆژێ لە ڕۆژان دروشمەکە زیندوو دەبێتەوە، لەو کاتەی یەکێتی نووسەران بکەوێتەوە دەست خاوەنی خۆیەوە، ئەسڵی وێنە هێڵکارییەکەش لە ئەرشیفی ئێمە پارێزراوە.

## وێنەی شەرەفخانی بدلیسی

دروستکردنی وێنەی شەرەفخانی بدلیسی پرۆژەیەکی کۆن بوو هەموو خوێندەوارێکی کورد بە پەرۆشەوە چاوەنۆڕی هێنانە ناوەوەی بوو. لە ساڵی ١٩٦٨ەوە من بیرم لەوە کردبووەوەو پێشنیازم بۆ بەدیع باباجان کردبوو، لەسەر ئەو باوەڕە بووم کە بەدیع لە هەموو کەسێکی دیکە زیاتر شایانی ئەوەیە ئەم پرۆژەیەی پێ بسپێردرێ، بۆ ئەم کارە تاقیکردنەوەی هەستی درێژخایەن کارێکی پێویست بوو، لەبەرئەوە پەلەی لێ نەدەکرا. من زۆر چاک لە بیرمە لەوساوە تا وێنەکە لەلایەن بەدیع باباجانەوە کرا باوەڕناکەم لە هیچ یەکتری بینینێکدا مەسەلەی وێنەی شەرەفخانی بدلیسم فەرامۆش کردبێ، لە هەموو چاوپێکەوتنێکدا مەسەلەکەم هێناوەتەوە بیری هونەروەری بەتوانا، هەر لەو سەردەمەدا لە دوای ١١ی ئاداری ١٩٧٠ وا ڕێک کەوت وەرگێڕانی کوردی شەرەفنامە ئامادە بێ بۆ چاپ، ئیتر ئەمە هەلێکی لەبار بوو وێنە هێڵکارییەکەی بەدیع باباجان لە کتێبەکەی شەرەفنامەدا بڵاو بکرێتەوە، پێویستە ئەوەش بۆ حەقیقەت و ڕاستی بخرێتەڕوو کە وێنە هێڵکارییەکەی بەدیع باباجان لەلایەن خۆیەوە پێشکێش بە کۆواری "شمسی کردستان = ڕۆژی کوردستان" کرا، ئیتر وێنەکە لە بەرگی دوایی لە ژمارە ٤ی ساڵی ٢ی کە دەکاتە حوزەیرانی ساڵی ١٩٧٣ بڵاوکرایەوە، ئەمە یەکەمین جار بوو وێنەکە بڵاو دەکرایەوە، هێشتا وەرگێڕانی کوردی شەرەفنامە بڵاو نەکرابووەوە، وەک ئاشکراشە ئەو کتێبە لە نامەخانەی نیشتمانی لە بەغدا ژمارە (٩١٦)ی ڕۆژی ١٩٧٤/١٠/٢٥ی دراوەتێ، واتە وەک وترا بۆ یەکەمین جار وێنەکە لەسەر بەرگی کۆواری "ڕۆژی کوردستان" بڵاوکرایەوە، ئینجا لە کتێبەکەی "شەرەفنامە". هەرچۆنێ بێ ئەو وێنەیە بە خامەی ڕەنگینی بەدیع باباجان دروست کراوە و یەکێکە لە بەرهەمە جوان و بەنرخ و سەرکەوتووەکان و بووە بە سامانی نەتەوایەتی کورد و هەموو دڵسۆزێکی کوردایەتی شانازی پێوە دەکا.

## ئەو ئەلبوومەی ئێمە دەمانەوێ دروستی بکەین

لە دوای بە یەکجاری دەرچوونم لە بەغدا لە ساڵی ١٩٨٢ بە هیچ جۆرێ پەیوەندیم لەگەڵ بەدیع باباجان نەبڕی، لە وڵات بووبم یا لە دەرەوەی وڵات. لە هەموو گەشتێکی بەغدام بەدیع باباجانم بەسەر دەکردەوە. لە ماوەی نەوەدەکان، دوو سێ جار بەدیع بەهۆی نەخۆشی چاویەوە سەری لە هەولێر دا، لە هەموو ئەو گەشتانەیدا لە نزیکەوە بە یەکتری

شاد دەبووین. هەر لەو گەشتانەدا بوو بونیادی کورم بۆ یەکەمین جار بەدیعی بینی و ئاشنایەتی لەگەڵدا پەیدا کرد، بەجۆرێک هۆگری بوو وەک مامۆستایەکی گەورەی خۆی تەماشای دەکرد، ئیتر نەخشەی پرۆژەیەکی کێشا لە بابەت بەدیع باباجانەوە، گەلێ زانیاری لێ وەرگرت و لە ئەنجامدا کەڵکێکی زۆری لێ بینی. پرۆژەکە بریتییە لە ئامادەکردنی ئەلبوومێک بۆ ئەو وێنە هێڵکارییانەی پێوەندییان بە ژیانی کوردەوارییەوە هەیە، وەک ئاشکراشە بەدیع هیچ جۆرە وێنەیەکی نییە لە دەرەوەی گێتی کوردەواریدا بێ. بەم جۆرە بڕیار وایە هەموو وێنە هێڵکارییەکانی کۆبکرێنەوە، هۆی دروستکردن و مێژووی دروستکردنیان بخرێتەڕوو، ئینجا بە مێژووی ژیانی درێژی هونەروەر بڕازێنرێتەوە. بڕیار وایە ئەلبوومەکە بەسێ زمان بڵاو بکرێتەوە بە کوردی عەرەبی و ئینگلیزی.

## بەدیع باباجانی شاعیر و نووسەر کاریگەری زانستی

ڕەنگە جێی موبالەغە نەبێ ئەگەر بڵێین بەدیع و باپیرانی بەدیع و کەسوکاری بەدیع کۆبکەینەوە ئەکادیمیا یا زانستگایەکیان لێ دروست ببێ بە هەموو جۆرە زانستی و زانیارییەکانی ئادەمیزاد.

بەدیع بۆخۆی زمانزان بوو، ئەو زمانانەی کە دەیانزانی پیاو بە ترسەوە خۆی پیشان دەدا ئەگەر بەرەو ڕووی ببوایە. شیعری بەو زمانە ڕۆژهەڵاتیانە هەیە، ئەوانەی دەیانزانی، لە لێکۆڵینەوەی ئەدەبی وەک مامۆستایەکی سەرکەوتووی زانستگا خۆی دەخستەڕوو، بە تایبەتی لەو ساڵانەی دواییدا لەبەر کزی چاوی کەمتر خۆی بە وێنەکێشانەوە خەریک دەکرد و زیاتر بایەخی بە ئەدەبی بەراورد دەدا. گەشتی لە نێوان ئەدەبی کوردی و عەرەبی و تورکی و فارسی دەکرد. بۆ ئەوەی پێوەندی لە نێوانیاندا بدۆزێتەوە. گەلێ نهێنی لەم لایەنەوە ئاشکرا کردووە، بەڵام بڵاو نەکراونەتەوە. مەرگ لەم لایەنەوە ڕێگەی نەدا ئامانجەکانی بهێنێتەدی. خوو ڕەوشتی بەرزی بەدیع باباجان بووە هۆی ئەوەی ناوبانگی لە پلەی هونەرییەکەی نەبێ. بەلای منەوە بەدیع باباجان لە جەوهەردا بەرهەمی هونەری و ئەدەبی شێوەی گێتی (عالەمی) وەرگرتووە، لایەنی ڕاگەیاندنەکەی کزە، چونکە خۆی باوەڕی بە پڕوپاگەندەی بڵقی ژێر ئاو نەبووە، بێگومان بەرهەمەکانی لەدوا ڕۆژدا ناوبانگی ڕاگەیاندنی هونەروەر بەدیع باباجان دەگەیەننە پلەی ناوەڕۆکەکەی..

هەولێر: مەڵبەندی ڕووناکی ١٩٩٨/١٠/٢٣

تێبینی: لە گۆڤاری ڕامان ژمارە ٢٩ وەرگیراوە.



## کۆچی هونەرمەند

# بەدیع باباجان

## کارەسات بوو

مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی

پێشەکی:

قوبادی و باباجانی (باوەجانی) دوو عێلی بە ناوبانگی کوردن بەوەوە شانازی دەکەن کە ڕۆڵەی بەخیان، ڕووی تیرەکانیان سپی کردووە، بۆ وێنە: هەستیاری مەزنی هونەروەری گەوهەر و مرواری هونەر لە رشتەی داستانی شەیدایی جەنگاوەری و بابەتی ترا بە شێوەی گۆرانی، شاعیری هەمیشە جاوید و نەمر "خانای قوبادی" ناوی عێلەکەی خۆی بەرز کردۆتەوە بۆ کەشکەلانی فەلەک.

بنەماڵەی باباجانیش نازناوی عێلی باوەجانییان گەیاندۆتە لووتکەی هونەر و وێنەگەری و پزیشکی و شعر و خۆشنووسی دکتۆر حوسەینی باباجانی پزیشکی نەشتەرکار و شاعیر و نووسەر و زانای زۆر زمانی بیانی وەکو فەرەنسی و ئەڵمانی و تورکی و فارسی بوو، لە شاری کەرکووک لە گەڕەکی ئاخی حوسەین، کە بە هەڵە ناوەکە گۆڕاوە بە ئاخور حوسەین خانوویەکی تەلار ئاسای هەبوو، پێوانەی حەوشەکەی پتر لە دوو هەزار مەتر بوو، باخێکی تەژی لە پرتەقاڵ و نارنج و سێو و هەرمێ و ترێ و دارخورمای تیابوو، ئەکەوتە پشتی بازاڕەکەی ئاخی حوسەین بەلای خۆرئاوادا بەرامبەر بە مزگەوتی نائب.

"حوسەین باباجان" لە کەرکووک لە دایکبوو بوو، بە منداڵی لە کەرکووک خوێندبووی، پاشان چووبوە کۆلێژی سپایی و لە ئەستەمبوڵ پزیشکی خوێندبوو، نەشتەرکارێکی لێزان و کارامە بوو پاش چەندین ساڵ خزمەت گەڕابووەوە نیشتمانەکەی خۆی، لەو ماڵە گەورەیەدا کە دروستی کردبوو چەند ژوورێکی تەرخانکردبوو بۆ بینینی نەخۆش (عیادە) و بۆ هاتن و چوونی خەڵک، دیوەخانێکی گەورەشی هەبوو هاودەمان و دۆستان و برادەران کە زۆرجار کۆڕی ئەدەبی تیادەبسترا هەر لە منداڵییەوە لەگەڵ شێخ ڕەزای تاڵەبانی هاوڕێ و هاودەم بوو حوسەین ئەفەندی ژن دۆستبوو چەند ژنێکی هەبوو چەند ڕۆژێک لە ماڵ دەرنەچووبوو شێخ ڕەزا ئەم فەردەی بۆ نووسیبوو:

"لە ترسی ئافرەتەکانی ئێستە واقی وڕە
حوسەین فەندی دوکتی وەک مریشکی کڕە"

شێخ ڕەزا بەوە وازی نەهێناوە کە جار جار پەلار بگرێتە دکتۆر حوسەینی هەواڵی، بەڵکو پەلاری گرتۆتە باباجانی خزمیشی دوو کەس لە خزمەکانی دکتۆر حوسەین بلەزەندەر و زل و زەبەلاح بوون، شێخ ڕەزا پەلارێکی تێگرتوون تەماشای ئەم فەردە بکەن:

"دوو جانەوەر هەن لە ئەسڵی جانی ئەمینی جان ئەمینی حاجی کەریم و ئەمینی باباجان.."

شێخ ڕەزا و دکتۆر حوسەین باباجان هەردوو خۆیان سەر بە تەریقەتی قادری ئەدایە قەڵەم لە کەرکووک کابرایەکی نەخوێندەوار خۆی بە پەیڕەوی ڕچەی نەقشبەندی ئەداتە قەڵەم، بێ بیرکردنەوەی داوا لەم دووە ئەکات لەسەر دەستی ئەو تەریقەتی نەقشبەندیتی وەربگرن، شێخ ڕەزا بە دوو بەیتە وەرامێکی توندی ئەداتەوە، بەڵام دکتۆر حوسەین بە قەسیدەیێکی فارسی (٤٢) بەیتی بەیتەکانی شێخ ڕەزای ئەخاتە ناو ( تضمین)، وادیارە شێخ ڕەزا کە زۆر مخلصی شێخ حسام الدین بووە و قەسیدە زۆر بە شکۆکەی دەربارە وتووە، لەبەر ڕێز شکۆی ئەو، تەنها گاڵتەیێکی پێکردووە.

تەماشای بکەن:

"خلیفە ساختە شێخ تەویلە تو خدی
بەڵێ خەلیفەی شێخ تەویلە خەرباشد"

کابرای خۆ بە خەلیفەی زان ناوی خۆی نابوو شێخ برایم جا دکتۆر حوسەین بەم جۆرە وەرامی ئەداتەوە:

ای خەلیفەی نەقشبندی ای شێخ ملک سروری
مشکل دارم کەحلش نیست سهل و سرسری

لە ناوەندی قەسیدە کەدا دەڵێ:

شێخ عامی چون تواند کرد ارشاد خواص
در کلیم الله مۆپر نیست سحر سامری.

ئینجا چوارینەکەی شێخ ڕەزا ئەخاتە ناو (تضمین)
کە ئەمەیە:

گهنە رندی چون رچا از خواند قادری
نقشبندی کی شود اسلام وانگە کافری؟
من هزاران شیر نرا درکمند اوردمام
مادە روباها توخواهی درکمندم اوری.

ئینجا دوکتور حوسەین قەسیدە (٤٢) بەیتی یەکەی، بەم فەردە تەواو ئەکات:

"مرغ جانم هرزمان گوید بە اهنک سماع
قادریم قادریم قادریم قادری"

دکتور حوسەین باباجان بە سێ زمان شیعری باشی هەبوو من دیوانەکەیم هەبوو لە کتێبخانەکەمان سووتا، لەم ڕۆژانەدا ئەم قەسیدەیەم لە دەفتەرێکا بەرچاوکەوت..

دکتۆر حوسەین لە یەکێ لە ژنەکانی کوڕێکی هەبوو لە کۆلیژی پزیشکی خوێندبووی سەرئەنجام شێتبوو بوو لە یەکێ لە ژوورەکانی ناو حەوشەکەوا بە زنجیر بەسترابووەوە ئێمە کە لاو بووین ئەچووین لە پەنجەرەکەوە قسەمان لەگەڵ دەکرد، نموونەی زیرەکی بوو، باسی فەلسەفەی کوردایتی دەکرد، لە ژنێکی تریشی سێ کوڕی هەبوو ئەبوبەکر و بەدیع و (...) ناوی ئەوی ترم لە بیر چووە لە ژنەکانی تری کچی زۆر بوو، ئەمانە پاش مردنی هێشتا منداڵ بوون ژنەکانی حەوش و ماڵەکەیان بەشکرد بە چەند خانوو...

بەدیع باباجانی هونەرمەند کوڕی ئەم دکتۆرە کەڵە شاعیرە بوو..

خوێندەواران هەموویان بەدیع دەناسن، لەم دواییەدا لەو قەلەندەر خانەیەدا بە خۆشنویسی و نیگارکێشییەوە خەریک بوو، پارەی کلێشەی کتێبی لەکەس وەر نەئەگرت ئەو وێنە قەڵەمی یانەی کە بۆکتێبی مێژووی ئەدەبی کوردی مامۆستا عەلادین کێشابووی هەر بە خەیاڵ بێ ئەوەی کە کەسێ ڕێبەدێی کردبێ گەواهی هونەرمەندی ئەوبوو. پیاوە بوو دەبێ زانا، هەستیار، خاوەن قەڵەم بلیمەت هەمیشە بێ نان و ئاو، لە قەلەندەر خانەکانیانا سەربنێتەوە کە کەس پێیان نەزانێ، کەس تەرمەکەیان نەبات بۆ سەر گۆڕ یا سەردانی ئینجا خەڵک خەفەتی بۆ بخۆن و هەوڵی ئەوە بدەن کۆڕێکی سەرشیوەنی بۆ سازبکەن،

"خەسرەو بەگی جاف بەڵێنی دابوو کۆڕێکی بۆ سازبکات، کە نووسەران پاش مەرگی بەسەر و پوتەڵاکیا هەڵبدەن"..

بەدیع جگە لەوەی هونەرمەند بوو، نووسەر و هەستیار بوو، لە یەکێ لە ژمارەکانی گۆڤارێکدا چەند هەڵبەستێکی چاپ کرابوو، بەبۆنەی ئەوەی کە هەندێ لە هەڵبەستەکانی بە زمانێکی بێگانە بوو ئەو ژمارەیە لەناوبرا و بڵاونەکرایەوە، ئەگەر هی ئەو قەلەندەرەبێ نان و ئاوە نەبوایە، ڕەنگە بە ئاوی زێڕ بنووسرایەوە..

شێخ ڕەزای تاڵەبانی هەرگیز ئەم جۆرە هەڵەی لەدەس نەداوە پیاوی پارەدار کە لە دیوەخانەدا بای لێ بەربێتەوە، پێی ئەوترێ (یرحمک الله) بەڵام پیاوی هەژاری قەلەندەر ئەگەر لە کۆڕێکا بپژمی پێی ئەوترێ ئەم گرمەیە چی بوو؟ (کە دەبوو ئەم یرمحک الله بوترێ)..

بەدیع باباجان، بە ڕووت و ڕەجاڵی خزمەتی ئەدەبی کوردی، هونەری کوردی خۆشنویسی کوردی کرد، هەرگیز باکی نەبوو لەوەی کە ؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟ ؟؟؟؟ حاڵی ئەو هەمیشە هەڵبەستەکەی شێخ ڕەزا بوو ئەو شێخ ڕەزایەی کە دەبوو نازناوی (لسان الحق)ی بدرێتێ هەروەک حافزی شیرازی کە نازناوی (لسنان الغیب) دراوەتێ، بەڵام بە داخەوە دوژمنێکی کورد (ئەدموندز) ناتوورەی هەچوکەرێکی کوردی بۆ بەکارهێنابوو، کەسیش لەو حەلەدا بەرپەرچی بۆ ئەو نەنووسیوە جا شێخ ڕەزا لە ژیانی هەزاران قەلەندەری وەکو بەدیعەوە وتوویە:

"شاهی کە نەبێت ڕازیم بە گەدایی
بۆ ئەهلی قەناعەت لە پڵاو چاترە دانوک"

بەدیع دڵت بە خۆت نەسووتێ لەپێش تۆدا حوسەین حوزەلی هونەرمەندی خۆشنووسی کلێشەکێشی هەستیاری ڕۆژنامەنووس مرد، هەژار و محەمەد تەرمەکەیان دانایە پشت و سەرشانی چەند کۆلکێشێ بردیانە گۆڕستان، بەڵام پاش مەرگ ئەوە پەنجا ساڵە ئەدیب و نووسەران بەسەر و پوتەڵاکیا هەڵئەدەن، تۆش وەک ئەو لەمەودووا هەرکەسێ فرچەیی قەڵەمێکی هەبێ یادت ئەکاتەوە، ئەدیب و نووسەران کۆڕت بۆ ئەگرن تۆ زیندووی لە دڵی هونەر دۆستانا نامەوێ لەمە پتر لە گۆڕەکەتا هەراسانت بکەم بە ئێزەی پاکژم سپاردەی کەمەیدان نەدا بە ئەیریمەن چرای گۆڕەکەت خامۆش بکات.. بە هەنسکەوە خواحافیزیت لێ ئەکەم.

دۆستی بنەماڵەتان

# لە کۆچی دوایی هونەرمەندی هەڵکەوتووی کورد مامۆستا بەدیع باباجاندا هەناسەیەکی سارد، ئاهێکی گەرم

محەمەدی مەلا کەریم



مامۆستا گیان!

دوێنێ لاپەڕەکانی (هاوکاری)ی هەفتەی ڕابردووم پەڕە پەڕە ئەکرد، لە دوا لاپەڕەی ژمارەی هەر دوێنێدا وێنەکەت لەبەر چاوانما زەق بووەوە.

هێشتا سەردێڕی بابەتەکەم نەخوێندبووەوە، ئەو مێژووەم بەرچاو کەوت کە لە دوو توێی دێڕە پیبیشینەکانیا بە ژمارە نووسرابوو بۆ چرکەیی دوان لە شوێنی خۆما سڕبووم چاوم هەڵبڕی بۆ سەرەوە، دیم هەواڵی ماڵئاوایی بەدیع باباجان نووسرابوو، تاسێکی قووڵ بردمیەوە، بە چاوێکی پڕ لە فرمێسک و دڵێکی پڕ لە قوڵپی گریانەوە، خەیاڵ بردمیەوە بۆ نووسینگەکەت کە لە گۆشەیەکی بەرانبەری دەرگاکەیا و لەنێوان دەیان قەڵەم و شووشە مەرەکەب و ڕەنگدان و کەرەستەی وێنەکردن و نەخشەکێشان و تابلۆی جوان جوان و پرۆژەی وردە مارکەی کەلوپەلی بازرگانیدا دائەنیشتی و لەولایشەوە کۆمەڵێ کتێبی جۆر بە جۆری بیانی و جاروبار خۆماڵیش ڕیزکرابوون و تۆیش چاویلکە لە چاو و قەڵەم بە دەست و تەختەی تابلۆ لە پێش دەمدا سەرت بەسەریاندا شۆڕ ئەکردەوە خەریکی کارە هونەرییەکانت ئەبووی، کە بەداخەوە بەشی زۆریان بۆ دابینکردنی ژیانی ڕۆژانە بوون.

خەیاڵ بردمیەوە بۆ ئەو ڕۆژانەی بە پلەکانە بەرزەم بۆ ماندووکەرەکانی (دارالخط عربي) یەکەتا سەرئەکەوتمە سەرەوە، لە پێشا سەرێکم ئەکرد بە ژوورەکەی کاکەئاورەحمانی کوڕی مامۆستا موحەممەدەمینی خۆشنووسی بلیمەتی کوردا و سلاوێکم لێ ئەکرد و هەواڵێکم ئەپرسی و ئەنجا ئەهاتم بۆلای تۆ و لەلای ڕاستیەوە مامۆستا مەهدی خۆشنووسم بە ڕوویەکی خۆشەوە ئەهاتن بە ڕووەوە، لاتان دائەنیشتم، تاوێ تەنها بە کوردی لەگەڵ تۆ و تاوێکی تریش لەبەر مامۆستا مەهدی ئەمکرد بە عەرەبی، لەگەڵی جۆرە بابەتی ئەدەبی و ڕۆشنبیری و کۆمەلایەتی ئەدواین.

دوێنێ کە ئەو هەواڵە دڵتەزێنەم خوێندەوە، لە دڵی خۆما گەڕامەوە بۆ چارەکە سەدەیەک لەمەوپێش، کە یەکەمجار بە ناسینی هونەرمەندێکی هەڵکەوتووی کورد سەربەرز و شەرەفمەند بووم، تازە تابلۆ پڕ بەهاکەی (شەرەفخانی بدلیسی)ت قەڵەمکێشی کردبوو کە مامۆستا هەژاری ڕەحمەتی وەرگێڕاوە کوردی یەکەی (شەرەفنامە)ی پێ ڕازاندەوە و پاش ئەویش گۆڤاری (ڕۆژی کوردستان) لەسەر لاپەڕەی دوایی بەرگی ژمارەیەکی خۆی لە چاپی دایەوە و بەوە ئەوەندەی تر بە کوردستان و دەرەوەیدا بڵاو بووەوە.

تازە، بۆ جاری دووەم، مامۆستای سەجادی (مێژووی ئەدەبی کوردی)یەکەی لە چاپ دابوەوە و ئەو گشتە تابلۆانەی کە لە سەرەتای سالانی پەنجادا بۆ ئەدیبانی ناوداری کوردت کێشابوون و هەر لە چاپی یەکەمی کتێبەکەیەوە بەو هۆیەوە بە هەموو کوردستان و دەرەوەیی ناساندبووی، بۆ جاری دووەم بلاوبوو بوونەوە.. بیرەوەری گێڕامیەوە بۆ ئەو ڕۆژانەی ئەهاتمە لات و داوای تابلۆی نالی، مەحوی، خانای قوبادیم لێ ئەکردی، یەکەم و دووەمیانت لەبەر ڕووناکی تابلۆی یەکەمجاریان و سێهەمیشت لە ڕووی نموونەیەک لە کتێبێکی ئەدەبی سەر بە کوردستانی ئەودیو بۆ دروست کردم (دیوانی نالی) و (دیوانی مەحوی) و (شیرین و خوسرەو)ی خانام پێ ڕازاندەوە.

گەڕامەوە بۆ ئەو سبەینان و عەسرە زۆرانەی لە ئێسگەی پاسی ژمارە ٧١ی مەیداندا تووشت ئەهاتم یا لە ماڵەوە ئەهاتی و لەوێ دائەبەزیت و بە پێ وردە وردە ئەچووی بۆ شوێنی کارەکەت، یان لەوێوە ئەگەڕایتەوە و لە ئێسگەکەدا ماوەیەک ئەبوو چاوەڕوان بی تا پاسێ پەیدا ئەبوو پێی ئەگەڕایتەوە، بەڵێ، چونکە گۆران واتەنی:

بەڵێ، دیارە لەناو قەومی بەسیتا قەدری سنعەتکار
وەکوو عەکسی قەمەر وایە لەناو حەوزێکی لیخندا.

سیستەمی کۆمەلایەتیی کۆمەڵە پاشکەوتووەکەت دەرفەتی ئەوەندەی بۆ ڕەخساندبووی ئۆتۆمبێلێکی سادە و بچکۆلەت پێ بێ بچیتە سەر کارەکەت و بگەڕێیتەوە ماڵەکەت.

بەڵکو ئەوەندەیشی بۆ نەڕەخساندبووی پاش پتر لە پەنجا ساڵ خزمەت خانوویەکت هەبێ بە دڵێکی بێ خەمەوە شەوی تیا ڕۆژ بکەیتەوە.. وەک خۆت بۆت گێڕاومەتەوە، پارچە زەویەکت وەرگرتبوو، ئەتویست بیکەیت بە خانوو.. بناخەیشت بۆ دانا، بەلام بۆت تەواونەکرا و ناچار فرۆشتت و لەم ساڵە گرانی یانەی کەماروی بە ناڕەوا بەسەر کەلەکەمان سەپێنراودا هەندێ کون و کەلەبەری ژیانت بە پارەکەی گرت.

خەیاڵ گێڕایمەوە بۆ نزیکەی ساڵ و نیوێ لەمەوپێش کە ئەبوو تیماری چاوت بکەیت کە ئاوی داهاتبوو ترسی ئەوەت هاتبووەڕێ لە نیعمەتی بیناییش بێ بەش ببی، نە خۆت پارەی نەشتەرکاریت هەبوو نە خەستەخانەکانی میریش پێویستیەکانی نەشتەرکاری بە خۆڕاییان تیا مابوو. ناچار بە یارمەتی هەندێ خزم و کەسوکار چوویتە هەولێر و لەوێ پزیشکێکی خێرۆمەندی بیانی نەشتەرکارییەکەی بۆ کردی و نەیهێشت لەم دوا دواییی یەی عومردا کلۆڵ و کەلەلا بکەوی..

مامۆستا خۆشەویستە ئەدیب و هونەرمەندە دڵسۆز و دڵپاکەکەم! تێر تێر لەسەر مێزی نووسینەکەم کە هەواڵی کۆچی دوایی یەکەتم لە (هاوکاری)یەکەدا خوێندەوە، بۆت گریام.. زیاتریش ئەوە قوڵپی گریانەکەمی خۆشتر ئەکرد کە قاچوقولە بە مەینەت لە دوام هاتووەکانم ئەم دوو سێ ساڵەی دوایی کەمتر ڕێیان ئەدام بێم بۆلات و بەو پلەکانە بۆ من زەحمەتانەی شوێنی کارەکەتدا سەرکەوم و ماوەیەک لەگەڵت دانیشم.. چونکە بە نەخۆشییە لە پڕ و بێ مۆڵەتەکەتم نەزانی بێم سەرێکت لێ بدەم و هەواڵێکت بپرسم و هەر هیچ نەبێ بۆ دواجار بتبینم.. پێشتریش ترسی مردنی بەم زوانەتم نەبوو تا بیر لەوە بکەمەوە باسێکی تێروتەسەلی ئەو بەرهەمە ئەدەبییانەی باو و باپیرتت لەگەڵ بکەم و بزانم لە دڵی خۆتا چ ڕەنگێکت بۆ بلاوکردنەوەیان ڕشتووە و قسەیەکی لێ بکەین چۆن ئەتوانین وا بکەین کە کوێر نەبنەوە، هەرچەندە چەند جاریش بە نیوە و ناتەواوی لێوەی دوابووین.. کە نەمزانی ئاخۆ، وەک گفتت دابوومێ، بیرەوەرییە هونەرییەکانی خۆتت لە چەند لاپەڕەیەکا گەلالە کردبوو یا نە تا کارێک بکەی ئەوەی دواڕۆژ بە بەرچاوڕوونییەکی پترەوە بتناسێ و مێژووی هونەری کوردی لاپەڕەیەکی پرشنگداری تریشی نەکەوێتە ژێر باری تەپوتۆزی کەس پێ نەزانیی دواڕۆژ؟

چەند بە ئاواتەوەم بە هەموو ئەوانەی ئەتناسن و قەدری ئەدەب و هونەرت ئەزانن کارێک بکەن زوو بە زوو پاشماوەی بەرهەمە هونەرییەکانت کۆبکەنەوە و ڕێکی بخەن و پێوەندی لەگەڵ گشت ئەوانە بکەن کە شاکارێکی تۆیان لایە هەمووی بخەنە یەک و لە یەکەمین دەرفەتی لواودا هەمووی لە دووتوێی بەرگی کتێبێکی ڕازاوەدا پێشکەشی وەچەی ڕۆشنبیری ئەدەب و هونەری کوردی بکەن.

مامۆستای کۆچکردووم!

لە ناوەخت ڕۆیشتی ، بە ناکام ڕۆیشتی.. ئێمەیشت لە پاش خۆت بە دڵ و دەروونێکی پڕ لە خەم و دەردەوە جێ هێشت.

سا، تا ئەو ڕۆژەی کاروانی مەرگ ئێمەش بە دوای تۆ و دۆستانی کۆچکردووی ترا ڕائەکێشێ، خوات لەگەڵ و گۆڕەکەت پڕبێ لە تیشکی ڕووناکی و یادت هەمیشە هەر پیرۆز و زیندووبێ!.

# مۆزەخانەی هونەر

ئەحلام مەنسوور

کاتێک کە هونەرمەندێ کۆچی دوایی دەکات لە خاکی درەختەکەیدا چەند گەڵا و نەمامێک سەوز دەبنەوە، کاتێک کە مامۆستا کۆچی دوایی کرد هەزار منداڵی هونەرمەند لە دایک دەبێت، بەڵێ ئەو سامانە زۆرەی کە بۆی بەجێ هێشتین وەک ئەو وێنە جوانانەی کتێبی مێژووی ئەدەبی کوردی و چەندین تابلۆی دی یەکەم نووسینگەی هونەری کە دامەزرا نووسینگەی هونەرمەند (بەدیع باباجان) بوو کە لەگەڵ (حاجی مهدی الجبوری)دا کە هەردووکیان هاوڕێی هونەر خۆشنووسین بوون، بارەگاکەیان لە شەقامی الرشید بوو.

هەموو پێنج شەممەیەک کاتژمێر ١١ سەرم لە مامۆستا بەدیع دەدا وەکو پەپوولە هەڵسووکەوتی دەکرد شیعری کلاسیکی بۆ دەخوێندمەوە و چەند دەماوکی منداڵ و کڵاو و وێنەی (ئەنیس و بەدەر)ی زنجیرەی تەلەفزیۆنی (افتح یا سمسم)ی پێشکەش دەکردم. .کە خۆی وێنە و نەقشیانی دەکێشا و خاوەن کارگەی وێنەی منداڵان و شیرەمەنی دروستکەرەکان بۆ پڕوپاگەندەی بەرهەمەکانیان مامەڵەیان لەگەڵ دەکرد، مامۆستا بەدیع ئاشنای شیعری تورکی کلاسیکی کوردی بوو دیوانی براکەیش کە چوارینەی تورکی نوسیووە لەلامە زۆر جاریش باسی خێزانەکەی دەکرد و چۆن ڕووبەڕووی گرانی دەبنەوە لەم دواییەشدا پێش ئەوەی فرمانی یەزدان بە جێ بێنێ هەستی کرد کە ماڵئاوایمان لێ دەکات بۆیە سەفەرێکی کرد بۆ هەولێر و خواحافیزی لە هەموو خزم و دۆستەکانی کرد، کۆمەڵەی خۆشنووسانی عێراقیش بە بۆنەی هەفتەیەک بەسەر کۆچی دوایی مامۆستامان کۆڕێکی ماتەمینییان بۆ سازکرد، هونەرمەندی کوردیش مامۆستا (احسان ادهم) لە بۆنەی کۆچ کردنی مامۆستا بەدیع زۆر پەرێشان بوو دەیوت برا گەورەی کۆچی دوایی کردووە، بە ڕادەیەک نەیدەتوانی قسە بکات و هەر بۆی دەگریا. .دۆستەکانی مامۆستا بدیع لە دڵیان نایەت بچنە نووسینگەکەی کە ئامۆژگاری خۆش نووسین بوو لەوێ چەندین قوتابی فێری خۆش نووس بوون. حاجی مەهدی جبوریش وتی بەبێ برای بەڕێزم کە زیاتر لە چل ساڵ هاوڕێیین لە دڵم نایەت کار لە هەمان ئامۆژگاکەمان کە خۆمان بەیەکەوە دامەزراندووە بکەم. داخی گرانم بۆ مامۆستا بدیع و هیوادارم لە شاری کەرکووک پەیکەرێکی لایق بەخۆی بۆ بکرێ و شەریکی خەمی هەموو هونەرمەندانی کوردم و هەروەهاش خێزانەکەی و سوپاستان دەکەین.

سەرچاوە:
ڕۆژنامەی هاوکاری
ژمارە (٢٥٧٩) دوو شەممە ٢ی کانوونی یەکەمی ١٩٩٦

# بە یادی هونەرمەند بەدیع باباجان

ئا: د. موحسین ئەحمەد عومەر

کۆتایی مانگی چواری سالی (١٩٩١)، لە کاتێکدا زیاتر لە دوو ملیۆن کورد لە ترسی تیرۆرو کیمیایی‌و قڕ کردن لەودیو سنوورەکانی ئێران‌و تورکیا ئۆقرەیان گرتبوو، تەواوی جیهان سەیری دەکردن، لە هەموو لایەک، بە تایبەتی لە ئەورووپا، کوردەکانی هەندەران، (کە ئەوسا ژمارەیان چارەکێکی ئەو ڕێژەیەی ئێستا بوو) پشێوی‌و ئالۆزییان تێکەوتبوو، لە هەمان حاڵەتی دەروونی‌و ئەخلاقی‌و ڕوحی دەژیان، هەر کەسە لە لای خۆیەوە هەوڵی دەدا بە ڕێگایەک یارمەتی‌و پشتگیریی ماددی‌و مەعنەوی کۆبکاتەوە، یان خۆی بگەیەنەتە سەر ئەو سنوورە وشک‌و ڕەقانەو لە نزیکەوە ئاگاداربێ‌و دەستی هەبێ لە جووڵاندن‌و چاککردنی هەندێ شت، ئەو ڕۆژانە تەواوی کوردی ئەورووپا لە جۆش‌و خرۆشێکی بێ وێنەدا بوون. هەموویان بیریان لە کێشەکەیان دەکردەوە، ئەو کاتە من لە سۆربۆن قوتابی بووم، لە ناو ئەم جۆش‌و خرۆشە، کۆمەڵەی (پزیشکانی بێ سنوور)ی فەڕەنسی داوایان لە ئەنستیتو کرد چەند کوردێکیان بۆ بنێرێ فەڕەنسی زان بن تا لەگەڵ ئەو تیمە پزیشکی‌و مرۆییە بەرەو ئێران بە ڕێ بکەون، سەرەنجام من‌و چەند کەسێکی دیکە ئامادەیی خۆمان پیشان داو ڕۆژی (٢٩-٤-١٩٩١) ئێمە گەیشتینە تاران، لە وێشەوە بە خێرایی بۆ سنە، ئینجا بۆ مەریوان، خۆمان گەیاندە ئەو تیمەی کە پێشتر لە مەریوان بارگەو بنەی دانابوو.

بۆ ڕۆژیی دوایی، بەیانی زوو –بەرەو سنوور چووین، کامپێکی گەورەی کوردەکان کە بەشی زۆریان خەڵکی ناوچەی هەڵەبجەو سەید سادقو ئەو دەوروبەرە بوون، لەم دیوەی سنوور، لە ناو ئێران، لە دەربەند دزلی گیریان خواردبوو. نزیکەی بیست هەزار کەسێک دەبوون، تەواو ئەو خەڵکە ژیانی لە ناو قوڕو سەرماو ئاو بەسەر دەبرد، گشت منداڵو مێرد منداڵو پیرەکان نەخۆشو ماندوو بوون، دەیان کەسیان بریندار بوون. چەندان کەس لەم کامپە گیانی لە دەستدا؟! ژیانی ناو ئەم کامپە وەک ڕۆژی قیامەت دەهاتە بەر چاوم، بە هیچ شتێک ڕانەدەگەیشتین، لە بەیانی تا ئێوارە، تا شەو بێ وەستان دەهاتینو دەچووین، سەدان منداڵو کچو کوڕی پارچەڵە لەم شاخانە، تا ئەژنۆ لە ناو قوڕو سەرما، ئاوارە و برسی بوونو دەخولانەوە، بێ مەبەستو مەنزڵگایەک دەخولانەوە، هیچ شوێنێک نەبوو بۆی بچن، دوایی بچن بۆ کوێ؟!

ئێمە کارمان ئەوە بوو، لەگەڵ تیمە فەرەنسیەکە بە زووترین کات بە شێوەیەکی وەختی نیشتەجێیان بکەینو ئاوی پاکو تەندروستی دابین بکەین، بۆیە بە زووترین کات، لە کۆمەڵە خێوەتێکی گەورە، نەخۆشخانەیەکمان دروست کرد بۆ ئەو منداڵو ژنو پیرانەی پێویستیان بە چاودێری پزیشکی چڕو بەردەوام هەبوو و لە هەمان کات خواردنیشیان مسۆگەر بوو.

ئەوانەی دیکە کە زیاتر ماندوو بوون، خواردنو دەرمانیان پێشکەش دەکرا. هەفتەیەک دواتر خەڵکەکە گوزەرانیان لەم لایەنەوە کەمێک چاکتر بوو.

ڕۆژێک لە ناکاو کابرایەکی پیری ماندووی چاو زیت لەبەر دەرگای خێوەتی نەخۆشخانە پەیدا بوو، بە فەرەنسیەکی نیمچە ڕەوان خۆی ناساندو گوتی من بەدیع باباجانم. منیش یەکسەر وێنەی شاعیرانی کوردی ناو کتێبی (مێژووی ئەدەبی کوردی) مامۆستا سەجادیم بە بیر هاتەوە. بۆ یەکەمین جار ئەو هونەرمەندەم لەسەر ئەم سنوورەو لەو ڕۆژە ڕەشەدا ناسی. لە دووری خەڵک لە بن خێوەتێک دەژیا، بە هەزار شەڕە شەق گەیشتبووە ئەو ناوە. وابزانم ژنێکیشی لە گەڵدا بوو. بەڵام نەمزانی چی ئەو بوو. دوای یەک دوو هەفتە مانەوە لەم دەربەندە، دیاربوو مامۆستا بەدیع لەم بارەی تێیدا بوو، لەسەر ئەم سنوورە، چ دڵگیری پێوە دیار نەبوو، چونکە بەبیرم دێتەوە، دەیگوت: بۆ خۆم لە ناو ئەم سروشتە جوانەم، لە کوێ ئەمەم دەست دەکەوێ، بە ڕاستیش وابوو، دەربەند دزلی ناوچەیەکی جوانە، کەمێک لەولاتر، بەرەو سنوور بڕۆیت، دەگەیتە دەریاچەی زرێبار، ئەم ناوچەیەش بەهاران بۆ خۆی بە هەشتێکە. ڕۆژی دوایی-واتە (١٥-٥-١٩٩١) بە خۆمو کامێراو ڕێکۆردەرێکی بچکۆلەوە، چوومە بن خێوەتەکەی مامۆستا بەدیع و ئەم گفتو گۆ بچکۆلەیەم لەگەڵ سازدا کە لەو ڕۆژانەدا هەر ئەوەندە دەکرا. ئێستاش بۆ یەکەمین جار دوای چەندین ساڵ بڵاودەکرێتەوە.

هەفتەیەک دواتر ئەو ناوەمان بەجێ هێشتو خۆمان گەیاندە کامپەکانی دیکە، تا ناوەڕاستی مانگی شەش لەسەر سنوورەکان لەم کامپ بۆ ئەو کامپ، ماینەوە ئەو سەردەمە ڕۆژانێکی ڕەش بوون. مرۆڤی هەستیاریان دەخستە ناو حاڵەتێکی زۆر وجوودیو هۆشیارییەکی ئەخلاقیو ڕۆشنبیری زۆر خەستو ڕاپەڕیو.

لێرەوە لە دامەنی ئەم هەستەوە ڕێگا بە خۆم دەدەم ئەو مەسەلەیە بورووژێنم، کە بە داخەوە، دیارە لە ناو ڕۆشنبیری کوردی ڕۆژی ڕەشی وا زوو زوو لە بیر دەکرێ چەندان سەردەمو ڕۆژانی قیامەتی کورد لە بیر کران. مرۆڤەکان چوونە کوێ؟ قوربانییەکان چوونە کوێ؟ ئازارەکان چییان بەسەر هات، ماندووبوونەکان کوان لە کوێن؟ دەپرسم کوا داهێنانە ئەدەبییە مەزنەکان ئەوانەی بتوانن وەک ئاوێنەیەک ئەم ڕۆژە ڕەشانە لە نێوچەوانو هەنیەی واقیعو ڕۆژگار بدەنو بیان گێڕێتەوە؟ ئایا ئەو کاتە نووسەرانو ڕۆشنبیران خەوتبوون؟ چۆن وا زوو ئەم ڕووداوانە، ڕووداو گەلی سەر سنوورەکان، لە بیر چوونەوە؟

**سەرەتا خۆت بە بینەران بناسێنە؟**

-من ناوم بەدیع حوسێن باباجانە، کوڕەزای میرزا بەدیع، دکتۆری دوایەمین دەوری بابانەکان، لە بەر ئەوە برای لە خۆم گەورەتر هیوای وابوو منیش بچمەوە سەر پیشەی ئەوان، بەڵام هەموو مرۆڤێ خولقەتی بۆ شتێکە، هەر لە منداڵییەوە هیوای مۆسیقام هەبوو ئینجا ڕەسم، لە حوجرە خوێندمو دوو جوزئی قورئانم تەواو کرد، پاش مردنی باوکم ئێمە بە هەژاری پەروەردە بووین، باوکم خانەوادەیەکی زۆری بەسەرەوە بوو ، فکری لە سبەینێ نەدەکردەوە، چی دەست بکەوتایە هەر ئەو ڕۆژە خەرجی دەکرد، من لە ساڵی (١٩٢٣) لە شاری کەرکووک لە گەڕەکی ((ئاخور حوسێن)) هاتمە دنیاوە کە سەر بە گەڕەکی گەورەی ئیمام قاسمە، هەر لەوێش گەورە بووم هەتا چواری ئامادەییو ساڵێ لە سلێمانی خوێندم، لە پاشان چونکە هیوایەتو مەراقم لە ڕەسم بوو، وەختی خۆی هاتمە بەغدا، هەر لەبەر ئەوەی باوکم ملی بۆ حوکمی عوسمانیەکان کەچ نەکرد، وەزیفەی پێ نەدراو بە هەژاری ئێمەی پەروەردە کرد، بەڵام باوکم سەر بەرزانە بە پیشەکەی خۆی موکتەفی بوو، چونکە باری قورس بوو، خاوەنی دیوە خان بوو، ئیتر ئێمە هەژار بووینو تەقاعودیمان بۆ حساب نەکرا، ئەوکات زەمانی ڕوپیە بوو ماوەیەک لە دوای ئەوە چواردە ڕوپیەو نیویان بۆ دایکێکو سێ کوڕ بڕیەوە لە ماڵێکدا، هەندێ ژوورمان بە کرێ دابوو، تا دایکم بتوانێ ئێمەی پێ بژیەنێ. ئێمە بەو شێوەیە ژیاین، برای گەورەشم شێت بووبوو، باوکم ناردبووی بۆ تۆپیەی ئەستەنبۆل لە هەمان مەکتەب کە خۆی تیایدا بوو بە دکتۆر، ئەو لەوێ لە غەریبی کە مردنی باوکمی بیست، ئیتر تووشی هێدمە بوو، لێی کردە شیزۆفرینیاو شێتییەکی ڕاستی. ئیتر دایکمو برام چونە ئەستەنبۆل هێنایانەوە کە لە ژێر چارەسەردا بوو، ئەو برایەم لە ساڵی (١٩٧١ز) پاش چلو دوو ساڵ شێتی پێ بە زنجیرەوە ئیفلیج بوو، عەمری خوای کرد، شێتییەکی توندی هەبوو.

**لە بارەی دروست بوونی هەستی هونەری خۆتو نزیک بوونەوەت لە هونەی نیگارسازییەوە، قسەمان بۆ بکە؟**

-بە فیکری من هەموو شتێ، هەموو مەراقێ هونەری، یان ئەدەبیو زانستی بێ، هەر لە منداڵییەوە لەگەڵ مرۆڤ وەک حەز لە دایک دەبێ، بە منداڵی بە گوێزان نەغەماتم لێ دەدا، هێشتا تەمەنم چوار ساڵان بوو

که دەمخستە سەر دۆلاب‌و میز و دەمچەسپاندو هاتوچۆم پێ دەکردو زیادو کەمم پێدەکردو بە پلەکانی نۆتەی موسیقی سروودم پێ لێ دەدا، مامۆستای پۆلی یەکی سەرەتاییم دەیووت، کێ فێری کردووی؟ دەموت نازانم، سەرەتا بە مۆسیقا هات ئێستاش هارمۆنیکای منداڵ لێدەدەم پێی دەڵێن ((هارمۆنیکای منداڵان، لە ماڵەوە دوانم هەیەو لە وەرشەی نەخشە ساز یش یەکێکم هەیەو لە فرسەتەکاندا کەیفی خۆمی پێ دەدەم، وەسیەتم کردوە ئەگەر مردم ئەوەم لەگەڵ بنێژن.

لە مۆسیقاش دوور نەکەوتوومەتەوە ئێستا دەمرم بۆ مۆسیقای کلاسیکی ، بۆ مۆسیقای جوان ئینجا لە یەکەو دووی سەرەتایی لەسەر دەفتەری وەزیفە ڕەسمم ئەکرد کە ئەرکی ماڵەوە بوو چۆلەکەو باڵندەم دروست دەکرد ڕۆژێ مامۆستاکەم دەستی خستە سەر دەفتەرەکەم‌و وتی ئەمە چییە؟

بە تووڕەییەوە وتی ((من ئەمڕۆ پیسترین قوتابیم دۆزیەوە)) منیش سەری خۆم شۆڕ کردو هەر دەیوتەوە ((ئەمە بۆ وەزیفە کراوە نەک ڕەسم...هەی...هەی...هەی)) وتی ئەگەر دەفتەرەکە تازە نەکەیتەوە دەستت بە ڕاستە دەکوتمەوە، بەڵام من هەر بەردەوام بووم تا ناوەندی، لە پێشانگادا بەشدار بووم‌و لەناو قوتابیەکاندا منیان دانابوو کە باش نیگار دەنەخشێنم، دوایی چوومە پەیمانگای هونەرە جوانەکان‌و ئیتر لەوێ دەرسم خوێندو بە ئیمتیاز دەرچووم، حەقی ڕەوانەکردنی دەرەوەم هەبوو دوو ساڵ هاتو چۆم کرد ساڵێکیان ڕەشید جەودەتی برای مەحموود جەودەت هات یارمەتیم بدات کە لە خێزانە کۆنەکانی سلێمانی بوو، هەمووان خزم بووین، بەڵام سوودی نەبوو نەیانناردم، کەسانی تر کە نمرەکانیان لە خوار منەوە بوو نێردران، گلەیی لە کەس ناکەم بەڵکو گلەیم لە بەختی خۆم هەیە.

**هەر لەسەر هونەری نیگارسازی بەردەوام بوویت، یان بواری دیکەشت دۆزییەوە؟**

-لە پێشدا تابلۆم دەکرد، هەر جارەی دۆستێک دەهات‌و لە ژێر دەستم دەری دەهێناو بە دیاری دەیبرد، بۆیە هەوەسم لەسەر تابلۆکان نەما، شتی خەیاڵیم دەکرد. تەکلیف دەکرام بە نیش‌و کاری شاعیران‌و نووسەران پاشان لە بازاڕ لەگەڵ دووبرادەر دوکانێکمان بۆ هێڵکاری‌و خۆشنووسی کردەوە ئیتر نووسەرانی کورد دەهاتنە لامان‌و لەوەدا توانیم حەزەکانی خۆم تێر بکەم، بەڵام تابلۆکانیشم لەبەر چاو کەوت، چونکە هیچی بە قیسمەتم نەبوو. ئێستا هیچم لای خۆم نەماوە هەموویان لێ سەندووم.

**هونەری شێوەکاری ساڵانی سی‌و چلەکان؟، کە تۆ ئەوکاتە لە تەمەنی هونەری گەرمدا بوویت. لە چلەکان لە پەیمانگای هونەرە جوانەکانی بەغدا دەرچوویت. هونەرمەندە بە ناوبانگەکانی ئەوسای کوردستان‌و کورد کێ بوون، ئاستی هونەری شێوەکاری کوردی چۆن بووە؟**

-هونەرمەندانی کوردی ئەوسا هێندە پەیوەندییان پێکەوە نەبوو تا شارەزایی یەکتر بن‌و یەک بگرن. بەڵام هی ئەم ساڵانەی دوایی کە ئەکادیمیاو پەیمانگای هونەرە جوانەکان هۆکار بون بۆ ناساندنی هونەرمەندان بە یەکتر لەوانە عەزیز سەلیم‌و محەممەد عارف‌و ئازاد شەوقی کە هونەرمەندی چاکن کورەکەی ئازاد شەوقیش ڕکابەری (مونافسی) باوکێتی. چاکترین پەیکەرساز کە بە پێوانەی کلاسیکی و تیۆرسازی و شیکار چالاکی هەبووبێ کورێکی زاخۆیی بوو ناویم لە یاد کردووە. دەتوانم بڵێم میللەتی کورد هەر لە زمانەکەیەوە دیارە کە زمانێکی شیعرییە وارسکێکی هونەری بە تەبیعەت لە هەموو کەسێکی ئەم میللەتە بەدی دەکەیت، دەمێنێتەوە سەر پێگەیاندنی ئەو وارسکە، زمانەکەمان لە موفرەداتدا یەکی ناکەوێ نە بۆ کێش‌و قافیە نە بۆ مانا نە بۆ واتا.

لە کەسانی هاوچەرخمان کە مامۆستام بووبن مامۆستا فایەق حەسەن‌و لە پاشان جەواد سەلیم، ئەمانە هونەرمەندی بەرزبوون لەو دواییەدا مامۆستا جەواد ڕێڕەوی خۆی گۆڕی بەڵام مامۆستای کلاسیکیم کە من خۆم حەزم لە هونەری کلاسیکە فایەق حەسەنە کە کەڵکی پێ گەیاندم، لە پاشان مامۆستایەکی ئیرلەندی بە ناوی شوشو مەکەنەتنی هات، زۆر لەگەڵمان ماندوو بوو، ئەمە لە ساڵانی چلەکاندا بوو ئەمەی دوایی ساڵی ((١٩٤٧-١٩٤٩)) وانەی پێ دەوتینەوە.

**دەربارەی ئەو وێنانەی کتێبەکەی مامۆستا عەلائەددین سەجادی کە لە ساڵی (١٩٥٢ز) چاپ بووە بە ناوی ((مێژووی ئەدەبی کوردی)) ئەمە چۆن بوو؟**

-لە ساڵانی دوای چلەکاندا تەکلیفی لێ کردم کە لە بەغدا بووین و لە گەلاوێژ، تەرکیزی دەخستە سەر وەسفی سەرو سیمایان، بە تایبەتی هی حاجی قادری کۆیی زۆر ماندووی کرد تا وەسفی سەرو سیمای دۆزیەوە ڕۆژێک پیاوێکی زۆر بە تەمەنی دیبوو کە خۆی حاجی قادریی بە چاوی خۆی دیبوو عەلائەددین سەجادی لە خۆشیدا وەخت بوو باڵ بگرێت دەمتوانی بەهەمان وەسف سەد ڕەسمی بۆ بکەم هیچی لە هیچی نەچێت ، بەڵام ئەگەر شتێکی وا ڕێکەوت یەکێ هەبێ وەسفیت بۆ بکات ئەوا کارەکە مەیسەر تر دەبێ هەر لەسەر ئەو وەسفە سکێچی یەکەم‌و دووەمی پەیکەرەکەی حاجی قادرم کێشا، ئەوسا خالید ڕەحال لە ڕۆما تەکلیف کرا مامۆستا ئیحسان شێرزاد کە وەزیری شارەوانی بوو خۆی چوو بۆ لای تەکلیفی کردم لە ڕۆما هات وتی ئەم وێنەیە سیماو ڕوخساری تەواویم بە سێ مەودا بۆ بکەیت، سکێچەکانم بۆ کردو بردی بۆ ڕۆما لەوێ جێبەجێی کرد، ئێمەیان بانگ کرد بۆ پەردە لادان لەسەر پەیکەرەکەو مامۆستا مەسعوود محەممەد لام وایە لە کۆڕی زانیاری کورد بوو، دوایی لەوێ وتارێکی ئەدەبی جوانی خوێندەوە، پەیکەرەکە وا بزانم لە ساڵی (١٩٧٠-١٩٧١) کرایەوە، من لە منداڵییەوە حەزم لە وردەکاری بووەو حەزم لێ بووە شت بە سروشتی خۆی ببینم‌و دەستکاری سەربەخۆی تیادا نەکەم، خوای مەزن ئەم سروشتە جوانەی ئافریدە کردووە، دەریایەکی گەورەیی بە شەپۆل‌و بێ پایانە پێویستی بەوە نییە من بێم شت بهاوەمە سەری با بتوانین تنۆکێ لەم دەریایە ڕەسم بکەین، زۆرم پێ سەیرە ئەوانەی لە کلاسیک



بەدیع باباجان

دەردەچن بۆ شتی تر دەگەڕێن وەک قوتابخانەکانی سوریالیو تەکعیبی، وا دەزانن هەموو کلاسیکیان هەزم کردووە، لە کاتێکدا لەم تێنگەیی بوونە بۆ کوێ دەچن، سروشتێکی خاوێن هەیە عەکسی بکەنەوە لە منداڵییەوە خوا منی بۆ کلاسیک خەلق کردووە و تا شتەکان بە سروشتی خۆیان بگوازمەوە.

## جگە لە هێڵکاری ماوەیەک لە تۆبۆگرافیو هەڵکۆڵین ئیشت کردووە؟

-سەبارەت بە تۆبۆگرافی هۆی ئەوە بوو کە لە ((مساحە عامە)) بووم، نانم لەسەر دەخوارد دیسان وەختی خۆی دائیرەکەمان چەند زەمالەیەکیان لەلایەن دەوڵەتی سویسرا پێ بەخشرا، هەندێکیان بۆ دائیرەکانی چاکسازی کشتوکاڵی بوون هەندێکیان ئاراستەی مەساحە کران، چونکە پێوەندی بە ڕەسمی کاری ((نەخشە))وە هەبوو، کاری من بریتیی بوو لە مەراتیبی بەرزایی تا بتوانین شێوەیەکی بەرجەستەو فۆتۆگرافی پێ بدەین، شتەکە بگاتە ئەو ئاکامەی بە فۆتۆگراف لە ئاسمانەوە وێنە گیراوە، بەو شێوەیە دەربخرێت، کاری من ڕیلیف بوو، شکور بە ئەنجامێکی باش گەڕامەوە دیبلۆمێکی تایبەتیان بۆ کردم.

پۆرترێتێکی شێخ ڕەزای تاڵەبانی هەیە کە نازانم کێ کردوویەتی، وەک بیستوومە تاڵەبانییەکان دەڵێن ئەمە لەو ناچێ، لە خۆیەوە کردوویەتی، هەتا ئەمە سەروپێچی تاڵەبانییەکان نییە، هاوکات شێخ ڕەزا هاوچەرخی باوکم بووە ڕەفیقی شیعریو دوژمنی شیعریشی بووە، لە دوو لاوە هەجووی باوکمی کردووە و لە دیوانەکەیدا، بە داخەوە لە هەندێکیاندا قسەی ناشرینی بە باوکم وتووە، یەکێ لەوانە نیوە شەو هاتوون بە دوای باوکمدا تەداوی بکات، دکتۆر کە ئەرکێکی پیرۆزی لەسەر شانە دوژمنی خۆیشی بچێت بۆلای دەبێ بە ڕێزەوە تەداوی بکات، تومەز ئەمە یەکێکە لە ناحەزانی شێخ ڕەزا کە پێی زانیوەو هەندێ قسەی ناشرینی بە زاری فارسی بە باوکم وتووە، لە پاشان

هەجووی ئەمینە فەندی مامی کردووە دەڵێت:

((دوو جانەوەر لە نەسلی جانی ئیبنی جا
ئەمینی حاجی کەریمو ئەمینی باباجان))

تەنانەت دەڵێن پیاوێکی زۆر فەقیرۆکە بووە، بەڵام چونکە وەچەی باباجان بە لووتزلی ناوبانگیان دەرکردووە، گوایە لووتێکی یەکجار زلی هەبووە، بۆیە لە جانەوەر چووە ئەگینا هیچ وەسفێکی تری نییە.

**ئەی لە بنەچەدا باباجان لە چییەوە هاتووە؟**

-ئەوە سەرگوزشتەی خۆی هەیە، باباجان هەردووکی ناوی باوکمە ناوێکی بە ئیستیلاحی باپیرمە، کە خۆی ناوی مەجابریە بووە، ئەوە ڕووداوێکی لە دوا هاتووە سەرەتا وەختی خۆی کە دێتە سلێمانی تەماشا دەکات لە هەموو لایەکەوە ئاڵای ڕەش هەڵکراوە ئەمە لە کاتێکدا مامۆستا محەمەدی مەلا کەریم لێی پرسیمو ئەو کات لە گۆڤاری ((بەیان)) بڵاوکرایەوە، لێرە حاکمی بابان کوڕێکی بووە عەمری خوای کردووە ئیتر ئەویش بە سیفەتی ئەوەی دکتۆرە دەپرسێ چی بووە دەڵێن هیچی نەبووە کەمێ سەری ژانی کردووە سەری خستۆتە سەر کۆشی باوکیو تەواو بووە، ئەویش دەڵێت: ئەو ناوەی کە پێتان شتووە بیبینم، گوایە زەمانی کۆن بەو ناوەی مردوو یان پێ شتووە زانیویانە ئەوە ئاوی مردووە، یان زیندوو، کە بردوویانە وتوویەتی ئەوە ئاوی مردوو نییە، دەمەوێ بیبینم، تەماشا دەکات لە هەموو لایەکەوە لە کۆشک هەڵپەڕکێ و شایبە و دەهۆڵ لێدانەو ڕەش بەڵەکە، ئیتر دەڵێن یەکێ هاتووە نیازمەندە بیبینێ، هەرچی دکتۆر ئەوەی لە توانایاندا بووە سەرفیان کردووە نەیانتوانیوە زیندووی بکەنەوە گەشتیارێک لە ناوچەکە دەبێت، ئەویش دێ دەیبینێ و دەڵێ چۆن بوو دەڵێن ئاوا بووە، دەڵێ بچنە دەرەوە و کەس لە ژوور نەمێنێ، قەدیمەکانی سلێمانی هەر کەس قسەیەک دەکات یەکێ دەڵێ لێی داوەو ئیتر، خولاسە ئیجرائاتێکی کردووە تومەز ئەمە دڵی بە کاتی وەستاوە و نەمردووە، ئیتر سەری دەخاتەوە سەر کۆشی باوکی، ئینجا کە هوشیار دەبێتەوە وادەزانێ هێشتا سەری لەسەر کۆشی باوکیەتی، ئەوانیش تاقەت ناگرن لە کونی دەرگاو پەنجەرەوە بۆی دەڕوانن و کە بە ئاگا دێتەوە دەڵێ "بابە"یەکسەر باوکی وەڵام دەداتەوە "وەی گیان"، ئینجا لەمەوە ناوبانگ بە "باوەگیان" پەیدا دەکات، ئینجا ئەوکاتە بەفارسی خوێندوویانە ناوی دووەمی بووە بە "جان"، ئینجا لە بەڵگەنامەکانی کۆندا کە هەمووی بڵاوکرایەوە بەناوی (الاوراق البابانیە) مامۆستا محەمەدی مەلا کەریم وێنەی گرتنەوە و بڵاوی کردنەوە ئەوانەشی تێدا بوو، لە هەندێکیان نووسراوە "حەکیم باباجان" و لەوی تریان "میرزا بەدیع" دوو ناوی هەبووە، دەیکاتە دکتۆری تایبەتی خۆی، بەڵام دەڵێ من ناتوانم لێرە بم، وەک گێڕانەوەش دەڵێن کچێکی خۆی داویەتێ تا بیبەستێتەوە، حەوت گوندی داوەتێ، لە ناویاندا قزڵەر و بەردەکەر هەڵدەبژێری و ئەوانی تر دەداتە دیاری بە جووتیار و مسکێنان، بەو شێوەیە لە سلێمانی دەمێنێتەوە، هەر بەم بۆنەیەوە ئەم دەفتەرەم لە بەردەستدایە شتێکتان بۆ دەخوێنمەوە، چەندینی وام بزر کردوە:

هاتی دنیا وە بریان
خەڵکی بەتۆوە خەندان
ئەمما تۆ زار و گریان
خەڵکی بە تۆوە گریان
ئەمما تۆ شادو خەندان

یان ئەمە:

لو نلت بیت شاعر
ففی العطا و لا تهمل
کی لا یضطر اخر
لکی یبیع منزل

ئەمە سەروادار نییە بەس حەزم کرد سەرواى بۆ دانێم.

**دێینە سەر خاڵێکی هەستەوەر، دەربارەی کۆمەڵی کوردەواری و بزووتنەوەی کوردی لە ساڵانی سی و چلەکان چۆن بوو، ئەوکاتە چ ڕووداوێکی گرنگ لە ژیانی کوردی عێراق هەبووە؟**

-لە سییەکاندا من منداڵ بووم، لەوکاتەدا شەڕی بارزان قەوما، بە بیرم دێ ماڵێکی موسڵاوی هاتبوون باڵەخانەی ماڵی باوکمیان بەکرێ گرتبوو، چونکە ئێمە حاڵمان باش نەبوو، دایکم ناچار بوو باڵەخانەکەش بەکرێ بدا، کوڕێکیان ئەفسەر بوو لە شەڕی بارزاندا، ئەو ڕۆژە گرتیان بۆ سبەینێ کوڕیان بە کوژراوی هێنرایەوە سوبحانەڵڵا، ناوی (عومەر وەهبی) بوو، هێنایانەوە ماڵی باوکم، ئەمە بوو بە مێژوویەک، ئیتر ئەمە لە سەرەتای سییەکان بوو، ئەوسا خۆت دەزانی بزووتنەوەکە لە چوارچێوەی داواکردنی مافی خۆیان نەترازابوو، تەنگیان پێ هەڵدەچنین و هەندێ باری ژیانیان تاڵ کردبوو، ئەو بوارەیان نەبوو هەموو میللەتی کورد ڕزگار بکەن.

**ئەوکاتە هیچ پارت و دەزگایەک نەبوو بەناوی کورد بدوێن؟**

-نەخێر، دوای ئەوە لە چلەکاندا شەڕی بارزانی دووەم قەوما، هیچ ڕووداوێکی ئەوتۆم لە یاد نییە، بەڵام لە بیستەکاندا شەڕی بەردەرکی سەرا قەوماوە و پاش شێخ مەحموود کە نەفی کرا و ئەمە دژی حکومەت و ئینگلیز بوون هەواڵیان بە پچڕپچڕی بە ئێمە دەگەیشت.

لە گۆڤاری ڕامان ژمارە (٩١) وەرگیراوە.

# بەدیع باباجان

## هونەرمەندێکی گەورە، بەڵام لە بیرکراو

بەختیار سەعید



کاتێک کە گوێمان لەناوی هونەرمەندی گەورە (بەدیع باباجان) دەبێت ڕاستەوخۆ ئەو نیگارانە بە بەرچاوماندا گوزەر دەکات کە بۆتە هێماو مێژوویەک کە زۆر ئەستەمە بتوانرێت هێندە بەئاسانی لە دەروون و ئەندێشەی کەسێتی کورددا بسڕدرێتەوە، ئەو نیگارانەی کە لە کتێبی (مێژووی ئەدەبی کوردی)ی عەلائەدین سجادی بۆتە هۆکارێک بۆ ناساندنی ئەو شاعیرە کلاسیکیانە کە خۆی لە شاعیران (مەلای جەزیری، بێسارانی، ئەحمەدی خانی، نالی، سالم، مەولەوی، مەلای جەباری، سەی یاقۆ، کوردی، حاجی قادری کۆیی، مەحوی، سالمی سنە، مەجدی، حەریق، بابە تاهیر، شێخ ڕەزای تاڵەبانی، ئەدەب) خۆی دەنووێنێت و چاپی یەکەمی لە ساڵی ١٩٥١ و چاپی دووەمی لە ساڵی ١٩٧١دا بووە، بەڵام ئەم هونەرمەندە بە تەنها ئەو هێڵکارییانەی نەکێشاوە، بەڵکو خاوەنی چەندین هێڵکاری هاوشێوەی هێڵکارییەکانی (مێژووی ئەدەبی کوردی)ە کە هێڵکاریی بۆ شاعیرانی بادینانی کێشاوەو لە کتێبی (هوزا نڤانێت کورد)ی (سادق بەهادین ئامێدی) کێشاوە کە ساڵی ١٩٨٠ چاپ و بڵاوکراوەتەوەو یەکێکە لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد و هێڵکاری شاعیران (عەلی حەریری، فەقێ تەیران، مەلا ئەحمەدی جەزیری، خالید زێباری، ئەحمەدی خانی، مەنسور گرگاشی، مەلا حوسێن باتەیی، پرتو



هدكاری، بەكر بەگ ئەرزی، شێخ نورەدین بریفكانی، تەها مائی، حسنی بامەڕنی)ی لە خۆگرتووە.

بەدیع باباجان سالّی ١٩٢٣ لەگەڕەكی (اخ حسین)ی شاری كەركووك لەدایكبووەو سالّی ١٩٥٠ پەیمانگەی هونەرە جوانەكانی بەغدای تەواو كردووەو دواتر لە (مدیریە مساحە العامە)ی شاری بەغدا وەك فەرمانبەرێكی هونەری كاردەكات و لەهەمانكاتدا لە سالّی ١٩٧٣ەوە وەك مامۆستای بەشی خۆشنووسی و زەخرەفە لە پەیمانگەی هونەرە جوانەكانی بەغدا وانەی وتۆتەوە بەوپێیەی یەكێك بووە لەو خوێندكارانەی كە پلەی یەكەمیان بەدەستهێناوە، هەروەها لەگەڵ نووسینگەیەكی كاری خۆشنووسی و كاری نەخشەسازی كاری دەكرد لەگەڵ خۆشنووسێكی شاری بەغدا بەناوی (مەهدی جبوری) و نوسینگەكەیان بەناوی (الخط العربی) بووە.

هونەرمەند بەدیع باباجان یەكێك بووە لەو هونەرمەندانەی كەزۆر بەسەلیقە بووە لەكارەكانیدا تا ئەو ئاستەی بانگهێشتكراوە بۆ نەخشەسازی دراوی عێراقی و دواتریش لەلایەن (عەلائەدین سەجادی)ەوە داواتنامەی كردووە تاكو هێڵكاری بۆ شاعیرە هاوچەرخەكانی كورد بكێشێت و ئەو هێڵكاریانەش هەموومان پێی ئاشنابووین كە لەكتێبی (مێژووی ئەدەبی كوردی)دا بڵاوكراوەتەوە.

هونەرمەند لەدیدارێكیدا كە لە ژمارە (٦)ی گۆڤاری (ڕەنگین)ی سالّی ١٩٨٨دا سازكراوە دەربارەی چۆنێتی كێشانی نیگاری شاعیران دەڵێت : (لە چلەكاندا لە شاری بەغدا بووم مامۆستای خوالێخۆش بوو عەلائەدین سجادی ڕایسپاردم كە وێنەی ئەو شاعیرانەی ناویان هەیە و باس كراوون لە كتێبەكەیدا بۆ بكێشم، منیش داوام لێكرد بە پێی توانا كەسایەتی چۆنێتی ڕوخسارو جلو بەرگیان و شێوەیانم بۆ ڕوون بكاتەوە لە دوایدا بەو پێیە وێنەیانم كێشاو سوپاس بۆ خوا توانیم جۆرە سەركەوتنێك بەدەست بهێنم و جێی ڕەزامەندی گشت لایەك بێت).

لەهەمانكاتدا بەدیع باباجان یەكێك بووە لەو هونەرمەندە عێراقیانەی كەنێردراوون بۆ خولی نەخشەسازی لەدەرەوەی عێراق و بۆ ئەو مەبەستە لەگەڵ چەند هونەرمەندێكی عێراقیدا ئەو خولە دەبینن، بەلاّم تەنها هونەرمەند كە لەخولەكە سەركەوتوو بووە هونەرمەند (بەدیع باباجان) بووە، لەهەمانكاتدا هونەرمەند خاوەنی چەندین كاری داهێنەرانەیە بۆ بەرگی كتێبی نوسەرە ناودارەكانی وەكو (یادگارو هیوا)ی مامۆستا (برایم ئەحمەد) هێڵكارییەكانی گۆڤاری (گەلاوێژ) بەرگی گۆڤاری (نزار)و دیوانی (شێخ سەلام)و كتێبی (اغانی كردستان)ی (د. مارف خەزنەدار)و كتێبی (بۆ كوردستان)ی هەژاری شاعیر، كۆمەڵە چیرۆكی (پێكەنینی گەدا)ی نوسەری ناودار (حەسەن قزڵجی) و نەخشەی هەرێمەكانی عێراق و نەخشاندنی چەندان پولی عێراقی و............. هتد.

یەكێكی تر لەو بەسەلیقییەی هونەرمەند لە بواری شیعردا بووە كە بۆ زۆر لەو كارانەی كە پێی سەرسام بووە شیعرێكی بۆ هۆنیوەتەوە لەوانە خۆشنووسی كورد (خەلیل زەهاوی) یەكێك بووە لەو هاوڕێیانەی كە لەنزیكەوە پێكەوە بوون، هەر لەو دیدەوە كتێبی (تشكیلات الخگ العربی) وەك دیاری دەبەخشێتە هونەرمەند (بەدیع باباجان) و ئەمیش لەدوای سەرسام بوونی بە كتێبەكە بە پارچە شیعرێك ئەو هەستەی دەربڕیووە.

دیدەكەم شادم بە (تشكیلاتی خەتی عارەبی)ت
پێشبینی ی گفت ئەدا خۆشنوسی ئەم ڕۆژگارە بیت
ئەی خەلیلی من- زەهاوی- خامەكەی ڕەهوانی تۆ
گۆ لە (سامی)ش وەرگرێ و تركیب ی نەك بێچارە بیت
گورەیی اعجازتە نەقشەی خەتی هەر لەفحەیەك
دەستی خورشیدیت هەیەو چۆن كوكبی سەیارە بیت
بۆ بە شهر أشوب ی ئەهلی خەت فسونی خامەكەت
ئەو بەنەقشی برق فشان ، تۆش بابلی ی ئەم كارە بیت
خەتی أیاتە وەكەر أیاتی خەت سەرمەشق ئەدەیت
فیچ ی ڕۆحانی ی هونەرتە گواهی بەم میقدارە بیت
زەردە خندت بێ وەرامی توانجی هەندێ كەچ- حروف
وەك نەسیمی ڕەهنما و هام سەعیدی ئەو عەیارە بێت
سەبری ئەیوبت هەبێ هەم عزم و هەم ایمانی ئەو
تاجی شاهانەی خەت كردۆتە سەر بەم بارە بیت
گەر لە خزمەتتا بیان ی لەنگ بۆ گفتاری (بەدیع)
مەستی نوری فەنتە و هەر دەست و ئەم انوارە بیت

تواناكانی شیعری بەدیع باباجان زۆر سەركەوتوانەو بەسەلیقەیی پێوە دیارە ئەگەر ئێمە بڕوانینە ئەو تەخمیسكردنەی غەزەلەی (حافیزی شیرازی) كە لە سالّی ١٩٩١دا نووسیویتی زمانەكانی كوردی و عەرەبیو فارسی و عەرەبی ئەوەش ئەو توانا زمانەوانییە و بەسەلیقەییە شیعرییە بەدەردەكەوێت كە لەناخی ئەم هونەرمەندەدا بوونی هەبووە.

بەیتی یەكەم و دووەم بە كوردی

ئەی كە فیردەوس بەئەندام و بە سیمای تۆ خوش
ئەی شەوی دەیجور و یەڵدای بە ڕوئیای تۆ خوش
ئەی هەر ئەعزای پەیزادی دڵ بە ڕوئیای تۆ خوش
ای همە شكل تو مطبوع و همە جای تو خوش
دلم ازعشوە شیرین شكرخای تو خوش

× × ×

دیدەكەت نەرگسی مەستانە خەواڵووی خەفیف
كە لە ئاستی گوڵی گۆناكەت ئەكا شەرمی زەریف
لەبێ ئاڵ و گەردن و سینەیە مافێكی عەفیف
همچو گلبرگ گری هست وجود تو لطیف
همچو سرو چمن خلدسراپای تو خوش

× × ×

بەیتی سێیەم و چوارەم- عەرەبی

تهمت مفتونا بسح الحسن فی الوجە الصبیح
حائز الطرف حیال الخد و الثغر الصریح

لمحه من ناعسیک بلسم قلبی الجریح
شیوه و ناز تو شیرین، خط و خال تو ملیح
چشم و ابروی تو زیبا، قدو بالای تو خوش

× × ×

فی دیار او قفار شرت او عرض البحار
او ژری الشم اری وجهک او سحق القرار
زین احلامی بک لکن لیالیها قصار
هم گلستان خیالم ز تو پر نقش و نگار
هم مشام دلم از زلف سمنسای تو خوش

× × ×

بەیتی پێنجەم و شەشەم - تورکی

أە عشقیله یانان اول کرم١عاشق زار
اصلیسیه کول اولوب گیتدی نەجاو نەمزار
نیجه مجنونلری، لیلالری سیلدیردی یازار
در ره عشق ز سیلاب فنا نیست گزار
کرده ام خاطر خودرا بتمنای تو خوش

× × ×

درد هجر مشکله گیچیر سەم هر شب بیزاریی
سوزو نالانم أشارسه کائینات باریتی
یا نغیینم سونمر اگرایچسه مده نیل جاریی
شکر چسم تو چه گویم که بدان بیماریی
میکند درد مرا از رخ زیبای تو خوش

× × ×

١-کرم واصلی: داستانێکی تورکیی ئاسیای ناوەندە کە چۆتە شێوەی ئەفسانەوە، باسی دوو خۆشەویست دەکات کە بەیەک نەگەیشتوون، بە ئاهی عیشق ئاگریان تێبەربوون و بوونە خۆڵەمێش و بەیەک نەگەیشتن.

بەیتی حەوتەم - فارسی

بخت خواب آلوده ام هردم زسیر و سفریست
گاه رویاهای زیبا و گهی دردسریست
نیست گلجبونی (بدیعی) که اینزمان جلوه گریست
دربیابان طلب گرچه زهر سو خطریست
میرو حافظ بیدل یتولای تو خوش

بەڵام ئەوەی کە جێگەی نیگەرانییە ئەوەیە تائێستا وەکو پێویست کار بۆ دنیای داهێنانی ئەم هونەرمەندە نەکراوە، ئەم هەوڵەش جێگەی خۆشحاڵییەو هۆکارێکی تری ناساندنی دنیای ئەم هونەرمەندە، بەڵام ئەوەی جێگەی شەرمەزارییە ئەم هونەرمەندە گەورەیە لەرۆژی ١٩٩٦/١١/١٥ بۆ دواجار بەجێی هێشتین و لەگۆڕستانی (محەمەد سکران) لەنزیک ڕاشدیە لەبەغدا بەخاک سپێردراو ماڵئاوایی لە هونەرو ژیان و داهێنان کرد.






المملكة العراقية






وزارة المعارف

# معهد الفنون الجميلة

ان وزير المعارف

بناءً على ما عرضه مجلس اساتذة معهد الفنون الجميلة وبناءً على اكمال الطالب بديع حسين باباجان المولود في كركوك سنة ١٩٢٣ منهاج الدراسة الفنية المقرر لفرع الرسم واجتيازه الامتحان النهائي المطلوب بنجاح قرر منحه دبلوم المعهد لفرع الرسم من درجة امتياز مع جميع الحقوق والامتيازات التي تخوله اياها هذه الدرجة .

كتب في بغداد في اليوم السابع عشر من شهر ذي القعدة من سنة الف وثلثمائة وتسع وستين الهجرية الموافق لليوم الحادي والثلاثين من شهر آب من سنة الف وتسعمائة وخمسين الميلادية

| | | |
|---|---|---|
| وزير المعارف | العميد | الاستاذ المختص |

| | |
|---|---|
| | |
| قانون هفتم در بیان ذات الجنب | |
| از قول اطبای انگلیز | از قول اطبای ایران |
| قانون هشتم در بیان ذات الریه | |
| از قول اطبای انگلیز | از قول اطبای ایران |
| قانون نهم در بیان ناخوشی نفث الدم | |
| از قول اطبای انگلیز | از قول اطبای ایران |
| قانون دهم در بیان ناخوشی ضیق النفس | |
| از قول اطبای انگلیز | از قول اطبای ایران |
| قانون یازدهم در ناخوشی خفقان | |
| از قول اطبای انگلیز | از قول اطبای ایران |
| قانون دوازدهم در ناخوشی سرفه و [illegible] | |
| از قول اطبای انگلیز | از قول اطبای ایران |
| قانون سیزدهم در ناخوشی برسام | |
| از قول اطبای انگلیز | از قول اطبای ایران |
| قانون چهاردهم در بیان ذات الکبد | |
| از قول اطبای انگلیز | از قول اطبای ایران |
| قانون پانزدهم در ناخوشی ورم معده | |
| از قول اطبای انگلیز | از قول اطبای ایران |
| قانون شانزدهم در بیان درد دل | |

از قول اطبای انگلیز | از قول اطبای ایران

١

## تەخمیسی غەزەلێکی (حافظِ شیرازی) :

بدیع باباجان - ١٩٩١

بەیتی/یەکەم و/دووەم - کوردی

ئەی کە فیردەوس بە/ئەندام و/بە سیمای تۆ خۆش
ئەی شەوی/دەیجور و/یەلدای بە رونیای تۆ خۆش
(١) ئەی هەر اعضای پەریزادی دلّ آرای ـــ تۆ خۆش
ای همه شکلِ تو مطبوع و همه جای ـــ تو خوش
دلم از عشوهٔ شیرینِ شکرخای ـــ تو خوش

× × ×

دیدەکەت نەرگسی مەستانە خەواڵووی خەفیف
/کە/ لە/ئاستی/گوڵی گۆناکەت ئەکا شەرمی ظەریف
(٢) / لە بی/ئاڵ و/ گەردن ـــ و/سینەیە /مافێکی عەفیف
همچو گلبرگِ طری هست وجودِ تو لطیف
همچو سروِ چمنِ خلد سراپای ـــ تو خوش

× × ×

بەیتی/~~[illegible]~~ سێی و/چوارەم - عەرەبی

تِهتُ مفتوناً بسحرِ الحسنِ فی الوجهِ الصبیح
حائرَ الطرْفِ حیالَ الخدِّ و الثغرِ الصریح
(٣) لمحةٌ من ناعسیكِ بلسمُ قلبی الجریح
شیوه و نازِ تو شیرین، خطّ و خالِ تو ملیح
چشم و ابروی تو زیبا، قدّ و بالای تو خوش

× ×

فی دیارِ او قفارِ سرتُ او عرضَ البحار
او ذُریٰ الشمّ اریٰ وجهكِ او سَحقَ القرار
(٤) زیّنَ احلامی بكِ لكنْ لیالیّ قصار
هم گلستانِ خیالم ز تو پر نقش و نگار
هم مشامِ دلم از زلفِ سمنسای تو خوش

× × ×

بەیتی پێنجەم و شەشەم - تورکی

آهِ عشقیله یانان اول کَرَم[١] عاشقِ زار
آصلیسیله کول اولوب گیتدی نه جا و نه مزار
(٥) نیجه مجنونلری، لیلالری سیلدیردی یازار
در رهِ عشق ز سیلابِ فنا نیست گذار
کرده‌ام خاطرِ خودرا بتمنای ـــ تو خوش

× × ×

درد هجرکله گیچیرسەم هر شبِ بیزاریی
سوز و نالانم آتشارسه کائناتِ باریی
(٦) یانغینم سونمز اگر ایچسه مده نیلِ جاریی
شکرِ چشمِ تو چگویم که بدان بیماریی
میکند درد مرا از رخِ زیبای تو خوش

× × ×

بەیتی حەوتەم - فارسی

بختِ خواب آلوده‌ام هردم ز سیر و سفر نیست
گاه رؤیاهای زیبا و گهی درد سر نیست
(٧) نیست طلبجوی بدیعی که اینزمان جلوه‌گر نیست
در بیابانِ طلب گرچه ز هر سو خطر نیست
میرود حافظِ بیدل بتولای ـــ تو خوش

[١] کرم و اصلی : داستانێکی تورکی ~~[illegible]~~/ئاسیای ناوەندە کە چۆتە شێوەکانی ئەفسانەیەوە، ئەم داستانە باسی دوو خۆشەویست ئەکا کە بەیەك شاد نەبوون . دوا ئاهی عەشقی کرم گری/ئاگر/ئەبێت و هەردوکیان /دە سوتێنێت و/ ~~[illegible]~~ بەبێ/ بە/خۆڵەمێش و/ با دەیبات ...

بەدیع باباجان

# گرافیک

## لۆگۆ - نیشانە بازرگانییەکان

تایبەتمەندییەکانی ئەم بەشە:
هەندێک لە بەرهەمەکانی هونەرمەند بەدیع باباجان وەکو ئەرشیف لەم بەشە دانراوە کە بریتییە لەکارە گرافیکییەکانی ئەم هونەرمەندە.

بە بینینی ئەم کارانە دەزانین کە لەو سەردەمە بایەخ دان بە دروست کردنی لۆگۆ و ئارم و نیشانی تیجاری و بازرگانی چەند گرینگ بووە . رەنگە ئەم کارانە لە چاو تەکنۆلوجیای ئێستا زۆر بێ بەها دیار بێت بەڵام بۆمان دەرئەکەوێت کە ئارمی تیجاری یان لۆگۆ جیاوازییەکی زۆری هەیە لەگەڵ دیزاینی بۆکس یان پاکەیج هەروەها بە هاتنی کاڵا و بەرهەمە دەرەکییەکان بۆ ناوعێراق، روانگە و بیرێکی تازەی بەم هونەرمەندە بەخشیوە بۆ کارە هونەرییەکانی.

بە دڵنیاییەوە بەدیع چاوی لە وەلاتانی دراوسێ و ئەوروپی هەبووە و هەستی کردووە بەم بۆشاییە و بۆیە هونەرەکەی لە خزمەتی بازار و کاری تیجارییەکانیش داناوە.
هاوکات تێکەڵبوون لەگەڵ ژیانی شارنشینی و جمۆجۆڵی ئابووری وڵات و بەرهەمهێنانی کاڵای خۆماڵی و رکەبەری ئابووری لە ناو بازار هۆکارێک هەبووە بۆ داواکاری دروست کردنی ئەم نیشانە گرافیکییانە.



# ديوان الشاب الظريف

الشاب الظريف

شمس الدين محمد بن عفيف الدين سليمان التلمساني

٦٦١ هـ ٦٦٨

حققه واعد تكملته وفسر الفاظه شاكر هادي شكر



المنى

مثلجات حليبية

المحتويات
حليب، سكر، زبدة، كاكاو، مطيبات، عطور والوان غذائية

لذيذة

منعشة

السعة
١٠٠٠ سم٣

علامة مسجلة

صنع في العراق

بغداد - شارع ١٤ رمضان - مقابل
المستلزمات الطبية - هاتف ٥٤٢١٠٤٥

٥٠٠

شراب ميلانو
نبيذ خالص
معتق ومستخرج من أجود الكروم بإشراف خبير إيطالي

إنتاج معمل شراب الرافدين - بغداد

pure MILANO wine



ROVAR No: 61



## بەدیع حسێن باباجان:

له منداڵییەوە حەزم لە وردەکاریی بووە و

بۆ کلاسیکیش خوڵقاوم

چاپخانەی



هەولێر – کوردستان
Aras Press
Kurdistan - Erbil